47
پرۆژەی تیشک

یوسف حاج ئەحمەد

# کۆچ

## کۆمەڵە چیرۆکێکی واقیعیی کۆمەڵایەتییە

وەرگێڕانی لە عەرەبییەوە

کاوە محەمەد شارباژێڕی

پرۆژەی تیشک -47

کۆمەڵە چیرۆکێکی واقیعیی کۆمەڵایەتییە

یوسف حاج ئەحمەد

لە عەرەبییەوە

**کاوە محەممەد شاربازێڕی**

2009-1430

**ناوی کتێب:** کــۆچ (کۆمەڵە چیرۆکێکی واقیعیی کۆمەڵایەتییە)

**نووسینی:** یوسف حاج ئەحمەد

**وەرگێڕانی:** کاوە محەمەد شارباژێڕی

**ژمارەی سپاردن:** ژمارە (١٢١٨)ساڵی (٢٠٠٩)

**نۆرەی چاپ:** یەکەم

**ساڵی چاپ:** ٢٠٠٩

**نەخشەسازی بەرگو ناوەوە:** فازل قەرەداغی

**لە بڵاوکراوەکانی:** پرۆژەی (تیشك)، ژمارە (٤٧)

**ناونیشانی پرۆژە لەسەر تۆڕی ئینتەرنێت:**

www.tishkbooks.com

**ئیمەیلی پرۆژە:**

info@tishkbooks.com

tishkbooks@yahoo.com

## دیاری و پێشکەشە

- بەسەرجەم خوێنەرانی هاوزمانم ..
- بەشەیدایانی هەق و ڕاستی بەوانەی هەردەم بەدوای زانستدا دەگەڕێن و خۆیانی لێ بەهرەمەند دەکەن و دەبنە ڕوناکی بۆ گەل و وڵاتەکەیان.
- بەوانەی یەك حەرفیان فێر کردم.
- بەو هاوەڵ و دۆستانەی کە درێغیان نەکردووە لە هاوکاری کردنم.
- بەوانەی هاندەرم بوون.

بۆ هەریەکێ لەوانە پێشکەشە

# پێشەكی

الحمد لله و الصلاة و السلام على رسول الله و على اله و صحبه و من والاه

كۆچ بەسەرهاتی ژیانی ئەو كەسانەیە كە ساتەكانیان لە بێ ئاگاییدا بەسەر دەبرد، بەڵام دەركەوتنی تیشكێكی بچوكی ڕۆشنایی خوایی ئەوانی بەرەو كاروانی خواناسی هێنایەوە .. كۆچ خەمی ئەوانە لە كۆڵ دەگرێت دوای گەڕانەوەیان بۆ ژێر سێبەری دادو یەكسانی لە هەوڵی كاركردنی بەردەوامدان بۆ ئاشنا كردنی كەسانی كرد تا لەو هەڵە و تاوانانە خۆیان بەدوور بگرن .. ئەم بەسەرهاتانە سەرمەشقن بۆ كەسانی تر تا پەند و ئامۆژگاریان لێوە وەرگرن .

خوێنەری خۆشەویست ..

چیرۆكەكانی ئەم كتێبە باس لە كۆمەڵێك ڕوداوی واقیعی دەكات، لە زمانی كەسەكانی ناو ڕوداوەكان خۆیەوە ئاگاداری بەسەرهاتەكان دەبین بە هیوای ئەوەی ببێتە یاد خەرەوەیك بۆ هەمو لایەكمان و سوودی لێ وەرگرین لە ژیانی ڕۆژانەماندا وەك خوای بالآدەست دەفەرموێت {فَذَكِّرْ إِن نَّفَعَتِ الذِّكْرَى }الأعلى٩ .

مرۆڤەكان توشی هەڵە و لادان دەبن بەڵام سەرەنجام كەسانێك كە خوای گەورە نوری هیدایەت دەخاتە دڵیانەوە دێنەوە سەر سفرەی خواناسی.

ئەم چیرۆكانە باس لەو كەسانە دەكات كە خوای گەورە بە هۆكارێك

ڕێگای هیدایەتی بۆ کردونەتەوە و لە ساتێکدا وازیان لەسەرپێچی هێناوە و بەرو لای خوا گەڕاونەتەوە و سەرەنجام لە ژیانی دواییاندا سەرکەوتوو سەرفراز بون.

ئەوەی کە ماوە باسی بکەم سەرچاوەی ئەم چیرۆکانە لە هەردوو کتێبی (دموع تائبە) و (حسن الخاتمە) وەرگیراون.

ئەمە یەکەم بەرگە و نۆبەرەیە .. دێتە دیدارتان بە ئومێدی ڕەزا بونی خوا و ببێتە مایەی پەند و ئامۆژگاری بۆ هەموولایەك.

والله المستعان

شاربازێڕی

٢٠٠٨/١٢/١٠

# فرمێسکی پەشیمانی

## کۆمەڵێك ڕوداوی واقعی و ڕاستەقینەیە

## لە زمانی کەسەکان خۆیانەوە

بیرت لەوە کردۆتەوە کتێبێك بەدیاری بدەیت بە کەسێك، بزانە ئەگەر خوا بەهۆی تۆوە کەسێك بخاتەسەر ڕێگەی ڕاست باشترە بۆت لە دونیا و ئەوەی تیایەتی.

﴿انت لاتهدي من احببت ولكن الله يهدي من يشاء﴾

﴿من كانت هجرته الى الله ورسوله فهجرته الى الله ورسوله﴾

- تەوبە کردنی پیاوێک لەسەر دەستی کچە پێنج ساڵانەکەی.
- تەوبە کردنی کچێکی نەصرانی
- گەڕانەوەی هونەرمەند شمایل
- برای مایکل جاکسۆن موسڵمان دەبێت
- دراوسێ ی ناو فرۆکەکە
- کچە خوێندکارێکی زانکۆ
- فرمێسکی باڵاپۆش
- نیعمەتەکان و تاوان
- پزیشکێکی ژنی ئەمریکی
- بەم جۆرە پرۆفیسۆر ولیام موسڵمان بوو
- موسڵمان بونی کچێکی ئینگلیزی
- گەڕانەوەی خێزانێک بۆ لای خوا
- تۆبە کردنی حاجیەک
- خۆشترین چیرۆک
- نامەیەک لە کچێکی ئەمریکیەوە

## تەوبە کردنی پیاوێك لەسەر دەستی کچە پێنج ساڵانەکەی

لە ڕیاز دادەنیشت ، بێ ئاگا و بێ هودە ڕۆژگاری بەسەر دەبرد .. خواناسی و بەندایەتی کردنی بۆ خوای تەنها زۆر کەم بوو، ساڵانێکی لە تەمەن گوزەراند بە بێ ئەوەی بچێتە مزگەوت یان سوجدەیەك بۆ خوا بەرێت.

ویستی خوا وەهابوو لەسەر دەستی کچەکەی خۆی تەوبە بکات و بەرەو مەملەکەتی ڕازی بونی خوا هەنگاو هەڵگرێت.

با لێگەڕێین لە زمانی خۆیەوە بەسەرهاتەکە ببیستین:

وەك خووی هەمیشەییم شەوگارم لەگەڵ کۆمەڵێك هاوەڵی خراپ بەسەر دەبرد، هەتا نزیکی بەرە بەیان بەو حاڵە دەمامەوە، کاتمان بە یاری و گەمەوە دەگوزەراند .. ژنەکەشم تاك و تەنها لە ماڵەوە دەمایەوە ، بەراستی ئازار و نارەحەتی چەشت کە تەنها خوای گەورە خۆی دەزانێ گوزەرانی چۆن بوو، بێزار بوو بوو ، خێزانێکی چاك و بە وەفا بوو لەو ماوەیەدا هەرگیز درێغی نەکرد لە ئامۆژگاری کردنم بەلآم من دڵم داخرابوو هیچم نەدەبیست.

وەك پیشەی هەمیشەییم لە درەنگانی شەودا بەرو ماڵ بومەوە ، بەناو تاریك و تنۆکی شەودا هەنگاوم دەنا ، کاتژێر سێی دوای نیوەی شەو بوو، گەیشتمە ماڵەوە زانیم کە ژنەکەم و کچەکەم بەخەبەرن، بێدەنگی ماڵەکەی لە باوەش گرتبوو، نەچومە لایان .. دەرگای ژوورەکەیانم نەکردەوە .. بەڵکو چومە ژورەکەی تەنیشت ئەوان، بۆ لەناوبردنی ئەو چەند کاتژێرەی شەو کە هێشتا ماوە ، چوم لە بەرامبەر ڤیدیۆکە دانیشتم و خۆم بە سەیرکردنی فلیمی بێ شەرمەوە سەرقاڵ کرد. ...

لەناو کاتە پیرۆزەکاندا خەریکی کاری قێزەون بووم ، ئەو کاتانەی کە باشترین کاتی شەو بوون، کاتی وەرگرتنی نزاکان وەك ڕەسولی ئەکرەم (صلی الله علیه وسلم) بۆی باسکردووین "خوای گەورە دێتە ئاسمانی دونیا" و دەفەرموێت:

هل من داع فاستجیب له؟ هل من مستغفر فاغفر له؟ هل من سائل فاعطیه؟

لەو کاتە پیرۆزەدا خوای گەورە دێتە ئاسمانی دونیا و بانگ لە بەندەکانی دەکات: کێ نزای هەیە وەڵامی بدەمەوە؟ کێ داوای لێبوردن دەکات تا لێی خۆش بم؟ کێ داوای دەکات تایبدەمێ؟

لەو ساتە پیرۆزانەدا من لەناو دیمەنی قێزەونی فلیمەکاندا نوقم بو بوم، دەرگای ژوورەکەم کرایەوە ، سەیرم کرد کچەکەم بوو ئەو هێشتا نەخەوتبوو، پێنج ساڵی تەواو نەکردبوو لە دەم دەرگای ژوورەکەمدا وەستا و سەرنجێکی پڕ لە سەرسامی و توڕەیی تێگرتم کە هەمووی مانا بوو، پاشان ووتی:

باوکە شەرمە بۆ تۆ لە خوا بترسە ....

سێ جار ئەم ڕستیەی دووبارە کردەوە و پاشان گەڕایەوە و بە دوای خۆیدا دەرگاکەی داخست، تووشی شۆکی کردم ، گێژ و کاس بووم ناچار ڤیدیۆکەم کوژاندەوە.

دانیشتم بەڵام قسەکانی ئەو هۆشی داگیر کردبووم بەردەوام لە گوێمدا دەزرنگایەوە ...

باوکە شەرمە بۆ تۆ لە خوا بترسە ...

دەستی نابووە بینە قاقام و هەر ئەوەندە بوو نەیدەکوشتم .

دوای کەوتم بەڵام گەڕابۆوە ناو جێگاکەی ....

لەو کاتەدا وەك شێت هەڵسوکەوتم دەکرد، نازانم چیم بەسەردا هات، بانگ

بێژی دەمەو بەیان بەخەبەری هێنام كە لـە بلـندگۆی مزگەوتەكەی نزیكمانە دەنگی دەهات.

دەنگێك كە دژی بە تاریكایی و بێدەنگی ئەو شەوە سامناكە دەدا، هێمنی و بێدەنگی ئەو چركە ساتەی شەوگاری دەشلـەقاند و نوێژ خوێنانی بۆ سەر سفرەی خواناسی بانگهێشت دەكرد ...

دەست نوێژم گرت و بەرەو مزگەوت ڕۆیشتم .. زۆر تامەزرۆ نەبووم بۆ نوێژ كردن بەلاّم ئەو چەند ووشەیەی كە لـە دەمی كچەكەمەوە هاتەدەر ناخی هەژاندم و توشی دلـە ڕاوكێی كردم ..

باوكە شەرمە بۆ تۆ لـە خوابترسە ...

قامەت كرا .. مامۆستای مزگەوت الله ئەكبەری كرد .. نوێژ خوێنان لـە دوای مامۆستاوە خۆیان بۆ گەشتی بەندایەتی ئامادە كرد، مامۆستا دەستی بە قورئان خوێندن كرد، بە گەیشتە سوجدە و دانانی ناوچەوانم لـەسەر زەوی خۆم بۆ نەگیرا دلـم پڕ بوو ... دەستم بە گریان كرد ، نەمدەزانی هۆی چیيە ؟ بۆچی دەگریم ؟ بۆ حەوت ساڵ دەچوو ئەمە یەكەم جار بوو سەر بخەمە سەر زەوی و سوجدە ببەم!

ئەو گریانە بۆ من سەرەتایەكی چاك بوو، فرمێسكەكان بونە هۆی ڕادان و پاك كردنەوەی پیسی و دوو ڕوویی ناو دەروونم .. دوای ئەوە هەستم بە ئارامی و باوەڕ كرد بە ناو گیانمدا دەگەڕا .. داوی ئەوەی ماوەیەك لە مزگەوت مامەوە بەرەو ماڵ بەڕێ كەوتم ، خەوم لـێنەكەوت هەتا هاتی كاتی چونە سەركار هات.

كە چوومە ژوور هاوڕێكەم سەرسام بوو، ئەمە یەكەم جار بوو وا زوو بچمە

سەرکار ، بەهۆی شەو بێداری و مانەوە لەگەڵ هاوەڵە خراپەکانمدا بەردەوام درەنگ دەچووم، بەو هۆیەوە پرسیاری لێکردم منیش هەرچیەك کە شەوی ڕابردوو ڕویدا بوو هەمویم بۆ گێڕایەوە ئەویش ووتی:

سوپاس گوزاری خوا بە بەر لەوەی مردن ڕێگەت پێ بگرێت و تۆش لەسەر ئەو بارە بیت خوای گەورە بە هۆی ئەم کچە بچوکەوە لەو بێ ئاگاییە خەبەری کردیتەوە .

کاتی نیوەڕۆ داوام لە هاوەڵەکەم کرد کە یارمەتیم بدات بچمەوە ماڵ پشوویەك بدەم چونکە ماوەیەکی زۆر بوو نەخەوتبووم.

زۆریش بەتاسەوە بووم بۆ بینینی کچەکەم کە هۆی هیدایەت و گەڕانەوەم بوو بۆ لای خوا.

کە گەیشتمە ماڵەوە ژنەکەم بە دەم گریانەوە پێشوازی لێکردم، کاتێك لێم پرسی هەورە بروسکەیەك لە جەستەی دام:

"کچەکەت مرد"

هەواڵەکە زۆر قورس بوو لەسەر دەورنم خۆم بۆ نەگیرا کەوتمە گریان، خوای گەورە هەردەم بەندەکانی تاقیدەکاتەوە بۆیە زانیم ئەمەش تاقیکردنەوەیەکی خوای باڵادەستە بۆ زانینی پلەی ئیمان و باوەڕم.

دوای ماوەیەك گریان هەستم بە ئارامیەکی دەروونی کرد. تەلەفونم بۆ هاوڕێکەم کرد تا بیّت بۆ لام و ئەرکم لەسەر سووك بکات .

هاوڕێکەم منداڵەکەی شت و کفنی کرد و دوای ئەوەی نوێژمان لەسەر کرد بەرەو سەرقەبران بردمان .. لەکاتی خستنە ناو گۆڕدا هاوڕێکەم سەیرێکی کردم و ووتی:

"گونجاو نییە کەسێکی تر جگە لە خۆت بیخاتە گۆڕەوە"

بە چاوی پڕ لـە فرمێسكەوە باوەشم كرد و لە شوێنی خۆی لـە ناو گۆڕەكە ڕامكێشا .. لـە ناخەوە لـە خوای باڵادەست دەپاڕامەوە كە لـە ڕۆژی دواییدا بۆم بكاتە قەڵغانێك و لـە ئاگر بمپارێزێت ، لـە هەمان كاتدا خوای خاوەن دەسەڵات بە جوانترین شێوە پاداشتی ژنە ئارامگرەكەم بداتەوە.

بەدەستی خۆم ئەو ڕۆشناییەم ناشت كە ڕێگای ڕاستی بۆ ڕۆشن كردمەوە .. ئەو چرایەیەی كە ڕێگای نیشاندام لـەناو شەوەزەنگی ئەم ژیانەدا.

## تەوبە کردنی نەصرانیەك

لەمیسر دەژیا، دوای گەشتێکی پڕلە گومان و نارەحەتی خوای گەورە هیدایەتی دا و بەرەو ڕاستی ملی ڕێگای گرتە بەر سەنا بەم جۆرە باس لە یرۆکەکەی دەکات :

هەر لە منداڵیەوە لەسەر دەمارگیری بۆ مەسیحی گەورە کرابووم وەك هەموو ئەوانەی لەسەر ئەو بیرکردنەوەیە گەورە بو بوون، دەبوو هەموو یەك شەممانێك لەگەڵ باوك ودایکم بچم بۆ کەنیسە بۆ ماچ کردنی دەستی قەشەکەمان و وتنەوەی سروتەکانی کەنیسە لەگەڵ ئامادەبوان و پاشان گوێگرتن لە قشە کاتێك ووتاری دەدا و تیایدا باسی عەقیدەی سیانی دەکرد و ئامادەبوانی دڵنیا دەکردەوە کە کەسانی تر جگە لە مەسیحی کارەکانیان قبوڵ نیە و سەرەنجام بەر خەشمی خوا دەکەون هەرچەندە کاری چاکەشیان هەبێت چونکە "بە بڕوای ئەو" ئەوانە بێ باوەڕن.

لەگەڵ هاوڕێ منداڵەکانم گوێم لەو قسانە دەگرت بەڵام هیچ تێنەدەگەیشتم ، هەر ئەوەندەش لەوێ دەهاتمە دەر یەکسەر ڕام دەکردە ناو هاوڕێ موسڵمانەکانم و یاریم لەگەڵدا دەکردن .. قسەکانی قەشە کە چاندنی ڕق و کینە بوو لە دڵی ئامادەبوانی کەنیسەدا هیچ کاریگەری لەسەر دەروونی من نەبوو چونکە دونیای منداڵ پاکە.

سەنا لە پاریزگای سویس دەیخوێند، بە تێپەڕ بونی رۆژگار گەورە بوو و چەند هاوڕێیەکی موسڵمانی پەیدا کرد ، بەم جۆرە باسیان دەکات :

ئەوان هەردەم خاوەن ئاکاری جوان بوون ، بەردەوام وەك خوشك مامڵەیان لەگەڵ دەکردم و ئەوەی بەلایانەوەگرنگ نەبوو جیاوازی ئاین بوو، لە دواییدا لەمە گەیشتم کە ئیسلام بەمەبەستی هەوڵدان بۆ موسڵمان بونی کەسانی تر و

رزگـار كردنیـان لــە تـاریكی و گــومڕایی هـانی شـوێن كـەوتوانی دەدا كـە هەڵسوكەوتی جوان بنوێنن لەگەڵ ئەو كەسانەی كە موسڵمان نین "بی باوەڕن یان لەسەر ئاینی ترن" جگە لەو ەسانەی كە دژی ئیسلام دەجەنگن وەك خوای گەورە دەفەرموێت:{لَـا يَنْهَـاكُمُ اللَّـهُ عَـنِ الَّـذِينَ لَـمْ يُقَـاتِلُوكُمْ فِـي الـدِّينِوَلَمْ يُخْرِجُــوكُم مِّــن دِيَــارِكُمْ أَن تَبَرُّوهُمْوَتُقْــسِطُوا إِلَــيْهِمْ إِنَّ اللَّــهَ يُحِــبُّ الْمُقْسِطِينَ} الممتحنة٨.

یەكێك لە هاوەڵەكانم هەرچەندە موسڵمان بوو بەڵام دۆستایەتی نێوانمان زۆر بەهێز بوو ، بەردەوام پێكەوە بووین مەگەر لەو كاتانەی كە وانەی ئاین بوایە لە یەكتر جیا دەبوینەوە .. سەرجەم ئەو فێرخوازانەی كە مەسیحی بوون مامۆستایەكی تایبەتمان هەبوو وانەی مەسیحی پێ دەوتین

زۆر دەترسام لەوەی پرسیار لە مامۆستاكەم بكەم (نەك مامۆستا تورە بێت) لە بارەی ئەو بۆچونەی كە مەسیحیەكان موسڵمانان بە بێ باوەڕ سەیر دەكەن ، لە كاتێكدا موسڵمانان خاوەنی كۆمەڵێك ڕەوشتی جوانن ... رۆژێك ورەم پەیداكرد و باسەكەم دركاند لە كاتێكدا پرسیارەكەم مامۆستاكەمی توشی شۆك كرد بەڵام بەدەم پیش خوادنەوەوە و زەردەخەنەیەكی ساردەوە ووتی:

تۆ بچكۆلەی هێشتا لە دونیا نەگەیشتوی، بەم دیاردە بچوكانە هەڵمەخەڵەتێ و ئەو راستیانە لەبیر مەكە كە ئێمەی گەورە لەسەر موسڵمانان دەیزانین ...

هیچم نەووت، هەرچەندە وەڵامەكەی نابابەتیانە بوو و قایلی وەرگرتن نەبوو، دوای تێپەڕ بونی ماوەیەك بەسەر ئەمەدا هاوڕێیەكی خۆشەویستم بە ماڵەوە چوون بۆ قاهیرە .. رۆژی جیابونەوە زۆر گریاین و دیاری و یادەوەریمان

لەگەڵ یەکتردا گۆڕیەوە، بەڵام هاوڕێکەم وەك بەڵگەیەك لەسەر قوڵی و گەورەیی هاوڕێیەتی بە دوای دیاریەکی بە نرخ و گەورەدا گەڕا هەتا بیکاتە خەڵات و بمداتێ بۆ ئەمەش قورئانێکی وەك خەڵات پێدام کە لەناو سندوقێکی بچوکی قەیفەدا بوو پێ ی ووتم:

بیرم لەوە کردەوە کە دیارییەکی گەورەت پێ ببەخشم وەك یادەوەرییەك لەسەر تەمەنی ڕابردوومان ، لە قورئان بەنرخترم نەدۆزیەوە کە ووشەی پیرۆزی خوایە.

بەو پەری خۆشحاڵیەوە قورئانەکەم لێ وەرگرت هەستم بە بەختەوەری کرد، بەڵام دەبوو لەبەرچاوی خێزانەکەم بیشارمەوە چونکە بەوە ڕازی نەدەبوون کچەکەیان قورئان هەڵگرێت.

دوای رۆیشتنی هاوڕێکەم هەرکات گوێم لە دەنگی بانگ بوایە دیارییەکەم بیردەکەوتەوە ... بانگێك موسڵمانانی بۆ نوێژ بانگ دەکرد منیش لەو کاتەدا دیاریەکەم دەردەهێنا و ماچم دەکرد بەڵام زۆر بە ووریاییەوە سەیری دەورووپشتی خۆم دەکرد نەك کەسێك بزانێ و خراپ بقەومێ .

رۆژگاری کچێنی بەسەرچوو .. لە کەنیسەی مەریەمی پاکیزە شووم بە شەماس کرد، بەرەو ماڵی هاوسەری شتەکانی خۆم پێچایەوە کە لەناویاندا دیاریە بە نرخەی تیابوو بەڵام نەمهێشت هاوسەرەکەم بیبینێ ، وەك هەر ژنێکی خاوەن وەفا و دڵسۆز کاتی خۆم لە خزمەتی هاوسەرەکەمدا بەسەر دەبرد ، خوای گەورە کردمیە دایکی سێ منداڵ .

لە دیوانی پارێزگا ئیشم دەکرد لەوێ لەگەڵ بوومە ئاشنای هاوەڵی کۆمەڵێك ئافرەتی باڵاپۆش کە بە بینیان هاوەڵەکەی خۆم م بیردەکەوتەوە ..

هێشتا موسڵمان نەبوو بووم بەڵام هەرکات دەنگی بانگ لە مزگەوتەوە بەرز

بوایەوە هەستێکی نادیار دایدەگرتم بەبێ ئەوەی بزانم هۆکەی چییە؟ لە کاتێکدا خێزانی کەسێك بووم لە کەنیسە کاری دەکرد و لەداهاتی ئەوێ خواردنی دەدا بە منالەکانی.

بەردەوام گفتوگۆم لەگەڵ هاوەڵە موسڵمانەکانمدا لەسەر دین و ڕەوشت دەکرد، بیرم لە ڕاستی ئیسلام و مەسیحیەت دەکردەوە ، هەڵسەنگاندنم دەکرد لەوەی کە لە کەنیسە لەبارەی ئیسلام و موسڵمانانەوە دەمبیست و ئەوەش کە خۆم ڕۆژانە بە چاو دەمبینی و هەستم پێ دەکرد کە لەگەڵ قسەکانی قەشە و دەمارگیرە مەسیحیەکان یەکی نەدەگرتەوە .

بەمەبەستی تێگەیشتن لە ڕاستی ئیسلام و دەستکەوتنی وەڵامێك بۆ ئەو پرسیارانەی کە لە سنگمدا پەنگی خواردبۆوە، بۆ دەستکەوتنی وەڵامی سەرسامی و تێڕامانەکانم ، ئەو کاتانەی پیاوەکەم لە ماڵ نەبوایە لە ڕێگەی تەلەفزیۆن و ڕادیۆوە بەردەوام گوێم لە ووتای مامۆستا و زانایان دەگرت .. قورئان خوێندنی شێخ محمد ریفعەت و شیخ عبدلباست سەرسامیان کردم بە بیستنی دەنگی ئەوان ئەو باوەڕەم لا دروست بوو کە نابێت ئەمە ووشەی مرۆڤ بێت بەڵکو جگە لە نیگای خوا هیچیتر نییە.

ڕۆژێك هاوسەرەکەم لەماڵ نەبوو فرسەتم هێنا وچوم بەلای گەنجینە بە نرخەکەمەوە "قورئانی پیرۆز" کە کردمەوە دەستم دەلەرزی و هەستم بە شلەژان دەکرد لەو کاتەدا چاوم کەوتە سەر ئایەتی {إِنَّ مَثَلَ عِيسَى عِندَ اللّهِ كَمَثَلِ آدَمَ خَلَقَهُ مِن تُرَابٍ ثِمَّ قَالَ لَهُ كُن فَيَكُونُ }آل عمران٥٩ چەند مامەوە ئەوەندە زیاتر هەستم بە لەرزین دەکرد، دەموچاوم عەرەقی دەکرد و موچرکە بە لەشمدا دەهات .. پێشتر قورئانم بیستبوو لای هاوڕێ موسڵمانەکانم، لە سەر

ڕێگا لە تەلەفزیۆن و ڕادیۆدا بەڵام هەرگیز ئەو هەستەم لا دروست نەبوو بوو، زۆرم حەزدەکرد کە بەردەوام بم بەڵام بە بیستنی دەنگی کردنەوەی دەرگای شوقەکە خێرا خستمەوە شوێنی خۆی و شاردمەوە و چووم بە پێشوازی هاوسەرەکەمەوە.

خوێندنەوەی ئەو ئایەتە بووە هۆی دانانی سنورێك لەلام بۆ ئەو هەزارەها پرسیارەی کە بەردەوام لە مێشکمدا دەهات و دەچوو ، بووە هۆی ئەوەی وەڵامم دەستکەوێت لەسەر سروشتی عیسا (علیه السلام )، ئایا ئەو کوڕی خوایە وەك قەشەکان دەڵێن ؟ (پاکوخاوێنی وبەرزی بۆخوا) یان پێغەمبەری خوایە وەك قورئان باسی دەکات؟ ئەم ئایەتە هات هەتا گومان بگۆڕێت بەڕاستی .. بۆ ئەوە هات تا ئاشکرای بکات کە عیسا نەوەی "ئادەم"ە علیهما السلام ، ئەو کوڕی خوانی یە وەك دەڵێن (لم یلد ولم یولد ولم یکن لە کفوا أحد) .

بەردەوام بە دوای وەڵامی ئەو پرسیارانەدا دەگەڕام هەتا گەیشتمە ڕاستیە نەمرەکە، ڕاستی ئەوەی هیچ خوایەك نیەیە جگە لە الله و موحەمەد نێردراوی خوایە .. ئەکرێ موسڵمان بونەکەم ئاشکرا بکەم ؟ ئەگەر وابکەم هەڵوێستی کەسوکارم چی دەبێت ؟ ئەی پیاوەکەم هەڵوێستی چۆن دەبێت ؟ منداڵەکانم چی؟

بۆ ڕۆژی دوای ئەوە لە کاتێکدا لەسەر کورسیەکەم لە فەرمانگە دانیشتبووم ئەم پرسیارانە و لەوەش زیاتر بە مێشکمدا دەهاتن کە جەنجاڵیان کردبووم و توانای ئیشکردنیان لێ بڕیبوم ، بیرکردنەوە لەو مەسەلەیە مێشکی دەگوشیم و خەریك بوو دەیکوشتم ، هەڵگرتنی یەکەم هەنگاو زۆر سەخت بوو توشی کێشەی زۆری دەکردم کەمەکەیان کوشتنم بوو لەلایەن کەسوکار یان کەنیسە یان پیاوەکەمەوە ، چەند هەفتە بەوجۆرە تێپەڕ بوو لەهەوڵی دۆزینەوەی

خۆمدا بووم ، هاوەڵەکانیشم توشی سەرسامی هاتبوون بەهۆی ئەوەی کە منیان بە کامەندێکی چالاك ناسی بوو بەڵام لەو رۆژەوە توانی کارکردنم وەك جاران نەمابوو .

بۆ دواجار ئەو ڕۆژە هات کە تیایدا توانیم خۆم لە هەموو ترس و ڕاڕاییەك ڕزگار بکەم، ئەو رۆژە هات کە لە تاریکایی بێ باوەڕیەوە بەرەو ڕۆشنایی ئیمان هەنگاوم هەڵگرت ، لە کاتێکدا دانیشتبووم بیرم شێوابوو بەرنامەم دادەنا چۆن ئەو کارە بکەم ..

لە مزگەوتێکی تەنیشتمانەوە گوێم لە بانگی نیوەڕۆ بوو .. بانگەوازی دەکرد بۆ موسڵمانان بۆ رۆیشتن بەرەو دیداری خوا .. ئەو دەنگە لەناو دەرونمدا دەهات و دەچوو و ئارامی دەبەخشی بە دەروونم ، ئەمە ئەو هێمنیە بوو کە بە دوایدا دەگەڕام ، هەستم بە تاوانباری دەکرد کە هێشتا لەسەر بێ باوەڕی ماوم ، لەگەڵ گەورەیی و بەرزی بانگەوازی خوداناسی کە بە لەشمدا دەهات و دەچوو .. هەستامە سەرپێ و بەبێ هیچ پێشەکیەك هاوارم کرد :

أشهد ان لا الـه الا الله و اشهد ان محمدا رسول الله

ئەم هەڵوێستە "بیستنی بانگی یەکتاپەرستی" هاوەڵەکانمی سەرسام کرد لە خۆشیاندا نەیاندەزانی چی بکەن .. بەدەم گریانەوە بەرەو پیرم هاتن و پیرۆزباییان لێکردم ، منیش خۆم بۆنەگیرا و لەگەڵ ئەواندا دەستم بە گریان کرد بە جۆرێك هەرگیز وەها نەگریاوم ، لە پەروەردگار پاڕامەوە کە لە ڕابردووی رۆیشتووم خۆش بێـت و بۆ داهاتووش لێم ڕازی بێت.

بڵاوبونەوەی ئەو هەواڵە لە دیوانی پارێزگا و پاشا گەیشتنی بە هاوەڵە مەسیحیەکان و توڕەبونیان لەو مەسەلەیە و پاشان بە زوویی هەواڵدانیان بە

کەسوکار و هاوسەرم شتێکی چاوەڕوانکراو بوو .. لەبەر ئەوە دەهاتنە سەردانم و وایان لێك دەدایەوە کە لە دوای ئەم بڕیارەوە هۆیەك هەیە.

هاوەڵە مەسیحیەکانم کەوتنە دەربڕینی وتەی پڕ لە کینە و بلاوکردنەوەی واتە وات بەڵام من هیچ گوێم بەو جۆرە پڕوپاگەندانە نەدەدا ، ئەوەی بەلامەوە مەبەست بوو ئاشکرا کردنی موسڵمان بونەکەم بوو بە شێوەیەکی فەرمی بۆ ئەو مەبەستە مامەڵەی پێویستم کرد و چووم بۆ سەردانی بەرێوەبەرایەتی ئاسایش ..

کاتێك هاوسەرەکەم بەکارەکەمی زانیوو لەگەڵ کەسوکارەکەی چوبونە ماڵەوە و جلەکانمی سوتاندبوو و هەرچیەکم هەبوو لەماڵوئاڵتون دەستی بەسەردا گرتبوو ، من ئەوانەم بەلاوە مەبەست نەبوو بەڵکو بۆ فڕاندن و شاردنەوی منالەکانم بێتاقەت بووم بۆ ئەوەی بیکەنە هۆیەك بۆ دروستکردنی فشار لەسەرم و ناچارکردنم بە گەڕانەوەم بۆتاریکی .

زۆر دەترسام لە چارەنوسی منالەکانم لە ناو کەنیسە و لەسەر باوەڕی سیانی "تەسلیس" پەروەردە بکرێن، کە سەرەنجامیان وەك باوکیان بۆ دۆزەخ بێت، ڕوم کردە خوا و دەستی نزا و پاڕانەوەم بەرزکردەوە هەتا منالەکانم بۆ بگێڕێتەوە و لەسەر ئیسلامەتی پەروەردەیان بکەم .. خوای گەورە نزاکەی وەرگرتم ئەوەبوو کۆمەڵێك بڕوادار خۆبەشخانە دەستی یارمەتیان بۆ درێژ کردم و ڕێنیشاندەرم بوون لە وەرگرتنی بڕیاری دادگا بەوەی بەخێوکردنی منالەکان بدرێت بە من چونکە ئەوان موسڵمانن.

چومە دادگا و بەڵگەی موسڵمان بونم خستە ڕوو، دادگا پشتیوانی لێ کردم لەبەر ئەوەی دوای موسڵمان بونم دروست نەبوو خێزانێکی کەسێکی ناموسڵمانبم بۆیە دادگا داوای لە هاوسەرەکەم کرد یان موسڵمان بێت یان لە یەکمان جیادەکاتەوە.

بەڵام خۆ بە گەورە زانین و هەستی دەمارگیری ڕێگەی پی نەدا بێتە ناو ئیسلامەوە، بەم جۆرە دادگا بڕیاری جیابونەوەیدا .. لەبەر ئەوەی منالّەکان هێشتا گەورە نەبوبوون[1] سەرپەرشتی کردن و بەخێوکردنیانی بە من سپارد، چونکە بە پیّ‌ی یاسا لەکاتی موسڵمان بونی هەرلایەك دایك یان باوك منداڵ دەدرێتەوە بە ئەولایە.

نارەحەتیەکان بەمە دوایی نەهات، سەرەتا وام دەزانی ئەمە کۆتاییە ئیتر ژیانم دەکەویێتەوە باری سروشتی خۆی ، بۆ تێکشاندن ڕوخانی لایەنی دەرونیم کەسوکارم و لە پێشیانەوە مێردی پێشووم کەوتنە دژایەتی کردنم و هەڵبەستنی پڕوپاگەندە و بڵاوکردنەوەی واتە وات .. هەموو ئەو خێزانە نەسرانیانەی کە پێشتر دەمناسین پەیوەندیان لەگەڵ پچڕیم و کەوتنە دژایەتی کردنم .. هەوڵی زڕاندن و ناشیرین کردنی کەسایەتیان دەدام، لەوەش زیاتر خێزانە موسڵمانەکانیان دەترسان هەتا یارمەتیم نەدەن و پەیوەندیم لەگەڵ بپچڕێنن.

لەگەڵ هەموو ئەو نارەحەتیانە هێشتا هەر بەهێز بووم .. بۆ بەرپەرچدانەوە و تێکشاندنی ئەو هەوڵانە دەستم بە باوەڕەکەمەوە گرتبوو، بەردەوام نزام دەکرد و دەستم بۆ لای خاوەنی ئاسمانەکان و زەوی بەرز دەکردەوە تا دەرووم لیّ بکاتەوە و هێز و توانام بداتی بەرگەی هەموو ئەو پڕوپاگەندانە بگرم .

خوای کاربەجیّ کە هەردەم نزیکە لە بەندەکانیەوە هات بە دەنگمەوە و دەرووی لیّ کردمەوە .

---

[1] مەبەستی ئەوەیە هێشتا "بالغ" نەبوون و لەڕووی شەرعەوە هیچیان لەسەر نییە لەبەر ئەوە لە ئیسلامدا ئەو منالانە بە موسڵمان ئەژمێردرێن.

ئەو بارە دەرونیەی کە تیا دەژیام کاری کردە سەر بێوەژنێکی هەژار کە لە پیاوەکەی چوار کچی هەتیو و کوڕێکی بۆ بەجێمابوو بەڵام خاوەن دەرونێکی بەرز بوو، سەرسام بوو بە دامەزراویم بۆیە داوای لێکردم کە شوو بە موحەمەدی کوڕی بکەم، دوای بیرکردنەوەیەکی کورت ڕەزامەندیم نیشاندا و بومە بوکی ئەو بێوەژنە چاکە بە ئومێدی ئەوەی هەمومان پێکەوە خێزانێکی نوێ دروست بکەین.

ئێستا بە ئارامی و بەختەوەری ژیان بەسەر دەبەین لەگەڵ قورسی وناڕەحەتی گوزەران سەرباری ئەو مامەڵە ناخۆشانەی خێزانە مەسیحیەکان بەرامبەرم دەیکەن یان ئەو ڕقەی کە لە لایەن مێردی پێشوومەوە یەخەمان دەگرێت.

لەگەڵ ئەو هەموو هەڵوێستە ناشیرینانەی کە خێزانەکەم لەگەڵی کردم داواکارم لە خوای باڵادەست کە هیدایەتیان بدات بۆ سەردینی ڕاست و ڕەحمەتی خۆی ببارێنێ بە سەریاندا وەك چۆن هیدایەتی منی دا و خستیمیە ژێر باڵی رەحمەتی خۆی .

ئەمەش بۆ خوا زۆر سانایە.

## تەوبەکردنی "شمایل"ی هونەرمەند

وتاری مامۆستا بە تەواوی کاریگەری لەسەر دروستکرد .. ویستی خۆی بکوژێت بەلام نەیانهێشت ، دوای ئەوە بڕیاریدا بە تەواوی واز لە هونەر بهێنی .. سەرچاوە نزیکەکانی خۆی باسیان لەوە کرد .. بڕیاری تەوبەکردن و گەڕانەوەکەی یەکجاریدا .. سەرباری پچڕاندنی پەیوەندیەکانی لەگەڵ پانتایی هونەردا بۆ هەتا هەتایە.

شمایل و هاوڕێکانی بۆ گێڕانی ئاهەنگێکی شەو لەوێ ئامادەبوون ، بۆ گوێ گرتن لە هەندێ گۆرانی و مۆزیك کە شمایل دەیویست لە ئەلبومە تازەکەیدا پێشکەشی بکات.

ئەو شەوە مامۆستایەکی ئاینی کوەیت لەگەڵ هاوەڵێکی کە لە بواری ڕاگەیاندندا کاردەکات هاتبوو بۆ ئاگادارکردنەوە ڕێنیشاندانی ئەو هونەرمەندانە.

بەر لەوەی ئامادەبووان گوێ لە گۆرانی و مۆزیك بگرن و دەست بە ئاهەنگەکە بکەن دەبوو مامۆستا تەنها بۆ ماوەی دە خولەك ووتار بدات، شێخی ووتار خوێن بەلای ئامادەبوانەوە کەسێکی خۆشەویست نەبوو بەڵکو ڕەزا قورس و چارە گران بوو.

مامۆستا دەستیکرد بە خوێندنەوەی ووتارەکەی، ئەو چەند ئایەتێکی بەسەر دانیشتواندا خوێندەوە ،باسی چەند فەرمودەیەکی کرد لەسەر تاوان و بەهەشت و دۆزەخ .

ووتارەکەی مامۆستا کاری کردە سەر شمایل .. خۆی پێ نەگیرا ودەستی بەگریان کرد ..بۆ ئەوەی خۆی بخاتە خوار لەناکاو بەرەو پەنجەرەکە ڕۆیشت

هاواری دەکرد و پەشیمانی دەردەبڕی.

خوا ڕەحمی پێ کرد ئەوانەی لەوێ بوون توانیان رزگاری بکەن ، مامۆستا دڵنیای کردەوە کە خۆکوشتن گوناهەکەی گەورەترە لە گۆرانی و تاوانی تر ، پاشان باسی لێبوردن و بەزەیی خوای بۆ کرد و ئەم ئایەتەی بەسەردا خوێندەوە: {قُلْ يَا عِبَادِيَ الَّذِينَ أَسْرَفُوا عَلَى أَنفُسِهِمْ لَا تَقْنَطُوا مِن رَّحْمَةِ اللَّهِ إِنَّ اللَّهَ يَغْفِرُ الذُّنُوبَ جَمِيعاً إِنَّهُ هُوَ الْغَفُورُ الرَّحِيمُ }الزمر٥٣

کاتێك ئەو هەواڵە بڵاوبۆوە کە شمایل واز لە هونەر دەهێنێت و بەرگی باڵاپۆش لەبەر دەکات،، لەلای خۆیەوە شمایل باسی تەوبە کردنی خۆی و خزمەت بە خێزانەکەی کرد.

بنەماڵەکەی بە گەرمی پێشوازیان لەم هەواڵە کرد چونکە بەهۆی ڕوکردنە هونەر و گۆرانی لە لایەن شمایلەوە ئەوان پشتیان تێکرد بوو، ئەو هیچی بە قسە نەدەکردن .

شمایل بەرەو کۆڕی ئیمان گەڕایەوە، گەڕایەوە هەتا خۆی لە ژەنگی تاوانەکان پاك بکاتەوە، مامۆستای ووتارخوێن بەم ئەنجامە زۆر دڵخۆش بوو، لەخوا پارایەوە کە شمایل دامەزراو بکات و بیپارێزێ و هیدایەتی کەسانی تری وەك ئەو بدات، هەر بەو بۆنەیەشەوە بڕیاریدا کە لەو جۆرە سەردانانە بۆ کۆڕو دانیشتنی هونەرمەندان دوبارە بکاتەوە بەمەبەستی ئاگادارکردنەوە و ئامۆژگاری کردنیان ..

خوایە دامەزراومان بکە و منەتی خۆت بڕێژە بەسەر سەرجەم هونەرمەنداندا .

"شمایل"ی دوێنێ و "مەریەم"ی ئەمڕۆ

بۆ دواجار کە هۆڵەکەم بەجێ هێشت گوێم لەم ووتەیە بوو:

کە گەڕامە ماڵەوە کاسێتەکانی ڕاشد ماجدم شکاند.

بە مەبەستی گوێکرتن لە بەسەرهاتی تەوبە کردن و گەڕانەوەی مەریەم کۆڕێك ریێکخرا ، بۆ ئەو مەبەستە ژمارەیەك لە کچان بانگهێشت کران کە ٥٠٠ ئافرەت دەبوون ، خوشکی کۆڕگێڕ هیوای خواست کە ئەو گەڕانەوەیە بەردەوام بێت ..

گەیشتن بە دیداری کەسێك کە لەزەتی لە هەردوو جۆری دنیا دەیبیێ چێژی تایبەتی هەیە, ژیانی هەق و ڕاستی لەدوای ژیانی بێهودەیی، کەسێك ببینین کە بە خواستی خۆی واز لە بەشێکی ئەو دونیایە دێنێ، واز لە کەم وکورتی ڕابردوو دێنێ، چەند جوانە کاتێك شمایل بگەڕێتەوە لای مەریەم.

## بڕوانامەی هونەر

- کێ ئەستێرەی ڕۆژهەڵات "ئوم کەلسوم"ی لە بیرە؟ کێ ئێستا گوێ لە گۆرانیەکانی دەگرێت ؟ هەیە بەڵام لای کۆمەڵێکی کەم لە بە تەمەنەکان .. چونکە ئەمڕۆ خواست لەسەر ڕیتمی خێرا زیاترە.
- تۆ بڵێی تەلال مەداح زانیبێتی کە بە مردویی لەسەر شانۆ دەکەوێت؟ بەڵام کەوت لەکاتێکدا عودەکەی لە باوەش گرتبوو؟ تۆ بڵێی بۆخۆی ئەم مردنەی هەڵبژارد بێت؟ ئایا فریشتەی گیانکێش بواری دا بگەڕێتەوە بۆ ماڵەوە؟
- کێ لە بیریەتی و بەزەیی بە (سعاد حسنی)دا دێتەوە ، ئەگەر بەزەیی پیایدا بێتەوە سوودی بۆی دەبێت؟ .. حاڵی بە چی گەیشت .. چۆن لە باروهەوایەکی ئاڵۆزدا مرد ، تا ئێستا نەزانراوە.
- ئەکتەری فەڕەنسی (شارل بواییە) خۆی کوشت.
- ئەستێرەی بەناوبانگ (مارلین مۆنرۆ) لەگەڵ جوانی و بەناوبانگیەکەی .. بە حەبی خەو خۆی کوشت.
- سوزان هیوارد .. عەرەق ژیانی لەناو برد.
- ئافا گاردنر .... بەهۆی سەرخۆشیەوە ئاگای لە خۆی نی یە .
- گریتا گاربو ... توشی شێتی خۆشاردنەوە بوو .

ئەگەر ئەمە جیهانی ئەو هونەرە بێت کە باسی دەکەین .. ئەگەر ئەمە کۆتاییەکەی بێت خوا بەرەکەتی تێ نەکات بۆچ هونەرێکە ، ژیانم بە مردن کۆتایی پێ بهێنی یان توشی دڵە ڕاوکێ و گۆشەگیریم بکات..

ئێمە بە تەنها بۆ هونەر دروست نەبوین ، هەرگیز نەمدیوە کێشەیەکی چارەسەر کرد بێت یان ستەمێکی هەڵگرتبێت.

ئەمڕۆ هونەرمەند كێشەیەكی هەیە ئەویش بون بە "ئەستێرە"یە، كێشەی گەیشتنە بە لوتكە و پارێزگاری كردنە لە لوتكە بوون، بەڵام نرخەكەی گرانە و زۆریش گرانە كە ژیان ساڵانێكی تەمەنە.

ئەم كێشەیە گەورە و گەورەتر دەبێت هەتا توانای خۆی لە دەست دەدات و ناتوانرێت دەستی بەسەردا بگیرێت، وەك بلّقی سابون وەهایە ، لەناكاو و لەبی ئاگاییدا بە دەموچاوی خاوەنەكەیدا دەتەقێتەوە.

لەوەش گەورەتر .. ژیانی ئەستێرەیەك .. ئەو ژنە گەنجەی كە لە جوانیەكەی خۆی دەبەخشێت بە خەڵكی ... هەتا رۆژێك سەرسام دەبێت كاتێك سەیری ئاوێنە دەكات دەبینێ جوانیەكەی دەوەرێ و دەوەرێ .. پاشان سەیر دەكات كە تەمەنی گەورە بووە و بەسەرچوە .. ئەو كاتە هیچ نابینێت كە هونەر ئەم وەلا دەنێت و دەیگۆڕێت بەكچێكی جوانی نوێ .. ئەو كاتە ئەستێرەی بەناوبانگ لە نێوان شەو و رۆژێكدا دەكەوێتە بەرەنگاریەكەوە كە بواری تری نیە، نەدین نە بەختەوەری نە رێگری .. نە كوڕ و نە هاوسەر .. بێگومان بیر لەوە دەكاتەوە كە لە تەمەن ڕابكات، هەتا تووشی دووەم بەرەنگاری نەبێتەوە كە لەناوبەرە .. لەگەڵ پیری و تەنهاییدا.

ژیانی ئەستێرەیی هەرچەندە دەوڵەمەندی و پارە و ناوبانگی تیادا بێت .. نرخی نیە و شوێنی بەزەی پێدا هاتنەوەیە .. چونكە بەر لەوە هەموو شتێكیان لێ سەنراوەتەوە .. هەموو شتێك.

## موسڵمان بونی برایەکی مایکڵ جاکسۆن

(ڕاگەیاندنی موسڵمان بوونم لەسعودیە بوە هۆی سەرسوڕمانی خێزانەکەم لە ئەمریکا) ....

خێزانەکەی (جاکسۆن ) لە ئەمریکادا بەگۆرانی و مۆسقا بەناوبانگن، ئەمەش دوای ئەوەی کە جاکسۆن تیپێکی مۆزیك و گۆرانی لە کوڕەکانی دروست کرد، هەر لە سەرەتای کارکردنیانەوە لە حەفتاکاندا تیپی (جاکسون فایف) سەرکەوتوترین تیپی گۆرانی ومۆسیقا بووە لە وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا، بە جۆرێك کە ناوبانگێکی جیهانی فراوانیان پەیداکرد.

ئەم تیپی گۆرانی و مۆزیکە توانی لە سەرکەوتنێکەوە بچێت بۆ سەرکەوتنێکی تر هەتا توانی بگاتە لوتکەی گۆرانی و مۆزیکی میللی لە ئەمریکادا، بۆیە کاسێت وشریتەکانی بەرزترین دەستکەوتیان هەبوو, گۆرانیەکانیان لەو کاتەدا زۆرترین فرۆشی هەبوو لە ئاستی جیهاندا, ئەم هونەرمەندانە خاوەن بەهرەی گەورە بوون، ڕێگای ژیانی گۆرانی و مۆزیك لە یەکتری جیاکردنەوە و هەریەك لەوان بۆخۆی تیپێکی تایبەتی دروست کرد و بەردەوام ئەوخێزانە پەیوەندییەکی بەهێزیان بە گۆرانی و مۆزیکەوە مایەوە.

جیرمن جاکسۆن برای مایکڵ جاکسۆن لەم ژینگەیەدا کە ناوەندێکی تایبەت بە گۆرانی و مۆزیك بوو گەشەی کرد، ئەو لە ناو خێزانێکی هونەریدا گەورە بوو ، کێ هەیە ناوبانگ و کاریگەری ئەو خێزانە لەسەر گۆرانی میللی ئەمریکی نەزانێت.

پێگەیشتن و پەروەردە بوونی لە ڕەوشێکی هونەری لەو جۆرەدا کاریگەری لەسەر ڕێڕەوی ژیانی دروست کرد بەجۆرێك هەتا ئەمڕۆ ئەو کاریگەریە

درێژەی هەیە.

جیرمن دوای ئەنجامدانی زنجیرەیەك سەردانی بە هاورێیەتی خوشکە گەورەکەی بۆ ژمارەیەك لە ولاتانی رۆژهەلاتی ناوەراست بۆ هەندێك کاری هونەری بەلام ئەنجامی ئەم گەشتە بە موسڵمان بوونی کۆتایی هات.

جیرمن لە دەمی منالانەوە ڕاستی ئیسلامی بۆ دەرکەوت وەك خۆی باسی دەکات:

لە سەردانمدا بۆ کۆمەڵێك لە ولاتانی رۆژهەلاتی ناوەڕاست، لەساڵی (١٩٨٩ز) بە هاوەڵی خوشکەگەورەکەم, سەردانی ولاتی (بەحرین)مان کرد, لەوێ زۆرکەس پێمان خۆشحاڵ بوون, جارێك لە مەنامە لەگەڵ کۆمەڵێك منالْ قسەم کرد.. ئەوەی سەرنجمدا لەم ماوەی ئەم گەشتەدا کۆمەڵێك لەو پرسیارانەی کە دەیانکرد لە بارەی ئاینەکەمەوە بوو, منیش وەلامم دەدانەوە کە مەسیحیم, بەلام کە من پرسیارم لە دینەکەیان دەکرد بەیەك دەنگ وەڵامیان دەدامەوە: کە ئاینمان ئیسلامە .

ئەوان زۆر شانازیان بە موسڵمانیەتی خۆیانەوە دەکرد, باسی ئیسلامیان بۆ دەکردم ... منیش پرسیاری زۆرم لێ دەکردن، هەریەکەیان بە شێوەیەك باسی ئیسلامی دەکرد سەرسامی دەکردم, ئەو مندالانەم زۆر خۆش ویست.. زۆر شانازیان بە ئاینەکەیانەوە دەکرد و بەخۆشیەکی زۆرەوە باسیان دەکرد .

## هاتن بەرەو سفرەی ئیمان

بەم جۆرە جیرمەن وەك خۆی باسی دەكات لە زاری منالآنەوە ئیسلامی ناسی ، لە چاوپێكەوتنێكی گۆڤاری "مجلە" ژمارە ٩٦٦ جیرمن چیرۆكی موسڵمان بونی خۆی دەگێڕێتەوە :

دوای ئەو وتوێژەی كە لەگەڵ منالەكان كردم ، بەحرەینم بەجێ هێشت بەلآم گومانم نەما كە موسڵمان دەبم ، بە مەبەستی پەیداكردنی شارەزایی لە ئیسلامدا قسەم لەگەڵ هاوەڵێكم كرد بەناوی (عەلی قەنبەر) ، باسی ئەوەم بۆ كرد كە هەستێكی تایبەتم لە بەرامبەر ئیسلام بۆ دروست بووە .. لەسەر ئەوە رێكەوتین كە پێكەوە سەردانی سعودیە بكەین هەتا زیاتر بە ئیسلام ئاشنا بم، ئەوە بوو لەوێ موسڵمان بونی خۆمم ڕاگەیاند.

جیرمین جاكسون هەر لەسەرەتای گەشەكردنیەوە خێزانەكەی خۆش دەویست سەرباری ئەوەی عاشقی گۆرانی و مۆسیقا بوو، بڕیاریدا كە لە كاروانی هونەر بەردەوام بێت و واز لەگۆرانی و مۆسیقا نەهێنێ, چونكە بە موسڵمان بونی لەو كەنالەوە پەیامێكی نوێ دەگەیەنێت.

هەستێكی تایبەتی لا دروست بوو كە لە رێگای ئیسلامەوە هەنگاوی نوێ بنێ بۆ پێشكەش كردنی كاری هونەر، ئەمەش بۆ خزمەتی ئەو هەزارەها هاندەر و خۆشەویستیەی كە هەیەتی, لە پێشكەش كردنی پەیڤێكی نوێ دا.

## وەڵامی پرسیارە سەرسامەکان

لە باسی گەشتەکەیدا ووتی :

دوای ئەوەی لەگەڵ عەلی قەنبەر چووین بۆ ڕیاز و پاشان چووم بۆ جەددە و پاشان راگەیاندنی موسڵمان بوونم ، خێزانێکی بەڕێزی سعودی لەگەڵ خۆیان بردیانم بۆ مەکەی موکەڕەمە (بنزير) بەمەبەستی کردنی عەمرە.

جیرمەن رۆژی موسڵمان بونی بە رۆژی لە دایك بوونی دادەنێت بۆیە ووتی:

چەند پرسیارم هەبوو کە سەرسامی کردبووم و بە دوای وەڵامەکانیاندا دەگەڕام, بە تایبەت ئەو پرسیارانەی کە پەیوەست بوون بە مەسیحیەت و عیسی علیه السلام، بەڵام هەر لە ساتی موسڵمان بونمدا وەڵامی ئامادە و باوەڕپێکراوم دەست کەوت.

لەناو خێزانێکی موحافیزکار و خاوەن دیندا لەسەر پەیڕەوی مەسیحی گەورە بوو بووم ، بەردەوام سەرسام دەبووم کە نوسینی ئینجل لەسەر دەستی کەسانی ئاسایی بووە.

بەردەوام ئەوەم بە بیردا دەهات کە ئەوانە مرۆڤن و هەر یەکەیان لایەنی خۆی وکۆمەڵەکەی دەگرێت لە کاتی نوسیندا.. لە کاتێکدا قورئان کتێبی خوایە و بەدرێژایی ساڵان و هاتنی نەوەکان خوای گەورە پاراستویەتی وەك دەفەرموێت: {إِنَّا نَحْنُ نَزَّلْنَا الذِّكْرَ وَإِنَّا لَهُ لَحَافِظُونَ }الحجر٩.

کاسێتەکانی "یوسف ئیسلام"ی گۆرانی بێژی بەریتانیم دەست کەوت کە سیمینار و کۆڕەکانی بوو لەسەر ئیسلام زۆر شتی لێوە فێربووم لە بارەی ئیسلام و موسڵمانانەوە.

## هەڵمەتی ڕاگەیاندن

(جیرمین جاکسون ) باس لە بونی هەڵمەتێکی خراپی ڕاگەیاندن لە دژی ئیسلام و موسڵمانان دەکات لە ئەمریکا, ئەوەی کە سەرسامی کردبوو خەڵکی ئاسایی لە ئەمەریکا لەبەر بێ ئاگاییان و نەشارەزاییان لە ڕاستی و پاکی ئەم ئاینە باوەڕ بەو ڕاگەیاندنە نارەوایە دەکەن ، چونکە قەبارەی ئەو چەواشە کرنەی کە دژی ئیسلام دەکرێت زۆر گەورەیە.

جیرمین دەڵێ:

ئەو هەڵمەتەی کە دەکرێت لە دژی ئیسلام موسڵمانان تەنها لە ڕێگای دەزگا جیاوازەکانی ڕاگەیاندنەوە نەبوو، بەڵکو پایتەختی سینەمای ئەمریکی (هۆڵیوود) لە ڕێگای فلیمەکانیەوە کە بەرهەمی دەهێنێت.. واپیشان دەدات کە موسڵمانان پیاوکوژ و ئیر هابیی و دڕندەن.

بەر لە موسڵمان بوونم و لە دوایشدا لە ڕێگای تەجروبەی خۆمەوە بۆم دەرکەوت کە نابێت خەڵك باوەڕ بەو فلیمانە بکەن کە (هۆڵیوود) بەرهەمی دەهێنێت، چونکە دوورە لە ڕاستیەوە .. دوورە لەو ئیسلامەی کە ڕۆشنایی و شارستانی هێنا، ئیسلامی لێبوردن و برایەتی، سەرباری ئەوەی ئەم فلیمانە دەبنە هۆی ئازاردانی هەموو موسڵمانێك و لە هەمان کاتدا زیان گەیاندن بە ئیسلام و موسڵمانان.

## ئیسلام و چارەسەر

جاكسۆن باسی لەوە كرد كە ئیسلام بۆتە هۆی چارەسەر كردنی هەموو كێشە و گرفتەكانی "ئێستا من مرۆڤێكی بێ كێشەم"، جاكسۆن خۆی گێڕایەوە:

ئیسلام كاریگەری هەبوو لەسەر ناخم و گۆڕانكاری باشی تێدا كرد، وەك پابەند بوون بە فەرمانەكانی شەرعەوە بە تەواوی لە خواردنەوەكان دوور كەوتمەوە و وازم لە هەموو حەرام كراوەكانی‌تر هێنا.

بۆ ئەوەی توانام لاواز بكەن و نەتوانم كاریگەری دروست بكەم لەسەر خێزانەكەم و موسڵمان بێن هەڵمەتێكی رێكخراو لە دژم بەرپا بوو تاوانباریان كردم بەوەی كە من دژی "سامی"م و ناكرێ لەگەڵ كەس بژیم، ئەمەش بۆ خۆی گاڵتە جاڕیە چونكە ئیسلام ئاینی پێكەوە ژیانە لەگەڵ كەسانی تر.

## دەنگ دانەوەی موسڵمان بوونی

لە بارەی دەنگ دانەوەی موسڵمان بوونی لە ناوەندی خێزانەکەیان، جاکسون دەڵێ:

لە ڕێی کە ناڵەکانی ڕاگەیاندنەوە و بەر لە گەیشتنەوەم بۆ ئەمریکا، دایکم بە هەواڵی موسڵمان بونمی زانی بوو .. چونکە هەر زوو موسڵمان بونی خۆم ڕاگەیاند و عەمرەم لە مەکەی موکەڕەمە کرد.

دایکم ژنێکی دیندارە و پابەندە بە ئاینەکەیەوە.. لە کاتی گەڕانەوەمدا بۆ ماڵەوە پرسیاری ئەوەی کرد..

جیرمین کوڕم ئەگەر تۆ دڵنیاییت لەو بڕیارەی کە داوتە و بە تەواوی بڕوات پێی هەیە ئەوە جێی گلەیی نیە؟

لە وەڵامدا وتم: ئیسلام ئەوەیە کە من ئەمهەوێت و بە تەواوی بڕوام پێیەتی.

موسڵمان بونی جیرمن بووە هۆی دەنگدانەوە بە تایبەت لەناو خوشك وبراکانیدا، جیرمین بەم جۆرە باسی دەکات : بڕیارەکەم بووە هۆی داچڵەکاندنی هەموو خێزانەکەم بۆیە پێی سەرسام بوون. چونکە لە کەناڵە جیاوازەکانی ڕاگەیاندنەوە زۆر شتیان لەسەر ئیسلام و موسڵمانان دەبیست بۆ نمونە بابەتی فرە ژنی ... ئەمریکیەکان لە گرنگی فرە ژنی نەدەگەیشتن لەکاتێکدا خیانەتی هاوسەری لە کۆمەڵگای ئەمریکیدا بەربڵاوە, بەڵام لە ئیسلامدا ئەمە شیاوە بە مەرجێك ئەو کەسە توانای بەخێوکردنی زیاتر لە ژنێکی هەبێت, ئەمە باشترین چارەسەرە بۆ نەهێشتنی خیانەت و تەڵاق.

جیرمین وتیشی: موسڵمانان لە وڵاتە عەرەبیەکاندا ژن و منداڵەکانیان خۆشدەوێت.. ژن لەلایان خاوەن ڕێز وکەرامەتە بەڵام زۆر لە ئەمریکیەکان

لەمە تێناگەن, زۆر سەرسامی شێوازی پەروەردە کردنی کۆمەڵگای ئیسلامی بووم.

جیرمین باسی لەوە کرد کە ئەو بەردەوام قورئان دەخوێنێ, لەکاتێکدا کە کتێبی ئیسلامی زۆری هەیە, بەڵام هەستی وایە کە ئەوکتێبانە هەموی لە قورئانەوە سەرچاوەی گرتووە بۆیە بەردەوام گرنگی بە خوێندنی قورئانی پیرۆز دەدات.

## دراوسێیەك لە فڕۆكەدا

كاتێك چوومە ناو فڕۆكەكە و لە شوێنەكەی خۆم دانیشتم هێشتا كورسیەكەی تەنیشتی ڕاستم چۆڵ بوو، ئەم فڕۆكەیە بڕیارە بەرەو ولاتێكی رۆژئاوا گەشت بكات ، كاتی فڕین نزیك دەبۆوە بەلام هێشتا كورسیەكە هەر چۆڵ بوو .. لە دڵەوە هیوام خواست كەس نەیەت و جێگاكە بە بەتاڵی بمێنێتەوە.. یان ئەوەتا خوای گەورە دراوسێیەكی باشم بۆ ڕەوانە بكات.. كە هاوكارم بێت لە تێپەڕاندنی كاتی گەشتەكەمان بە شتی بەسود و گوفتاری بە كەڵكەوە چونكە گەشتەكە دورو درێژە، چەند كاتژێرێكی پێدەچێت ، ئەگەر دراوسێكەت كەسێك بوو پێی دڵخۆش بویت ئەوا بێگومان كاتێكی خۆش بەسەر دەبەیت بەپێچەوانەشەوە ئەگەر كەسێك بوو لەجۆرە نەبوو كە دەیخوازیت ئەوا كاتێكی درێژ و بێتام دەبێت .. هەست دەكەیت كە دوو ئەوەندەی كاتی ئاسایی خایاندووە .

هەر چۆنێك بوو لەم دڵەڕاوكێیە ڕزگارم بوو ، بەر لە فڕین كەسێك هاتە جێگاكە، كچێك تەمەنی لە سەرەتای لاویدا بوو و عەبایەكی ڕەشی دابو بەخۆیدا كە قەراغەكانی جوانكاری تێدا كرابوو.

لەژێر عەباكەوە هەست بە جوانی و ناسكی ئەو كچە دەكرا بۆیە عەباكە توانای شاردنەوەی ئەو كچەی نەبوو، بۆنێكی سەرنج ڕاكێشی لەخۆی دابوو بەجۆرێك چاوی سەرنشینانی پلە یەكی بەرەو لای خۆی كەمەندكێش دەكرد ... هەرملیان بەرەو سەرچاوەی بۆنەكە ئاراستە دەكرد.

من و دراوسێكەم لە دوو وێنە دەچووین كە كەوتبوینە ژێر سەرنجی سەرنشینەكانەوە، سەرنجی كەسانێكی چاو باز كە بە دەورمانەوە بوون، سەیری یەكێك لەوانەم كرد كە بە چاو گەمارۆی جێگاكەمی دابوو ، لەناوچەوانیدا

ئەوە دەخوێندرایەوە "خۆزگە لە جێگاكەی تۆ بومایبە" .

لەو كاتەدا ئەو فەرمودەیەی پێغەمبەرم (صلی الله علیه وسلم) بیركەوتەوە ( طیب الرجال ما ظهر ریحه وخفي لونه وطیب النساء ماظهر لونه وخفي ریحه ) رواه الترمذي. ناخم بە لێكدانەوەی واتای ئەو فەرمودەیەوە سەرقاڵ بوو بۆیە لەخۆم پرسی : بۆچی ناسكی و نەرمونیانی ژن بەم جۆرەیە ؟ بێگومان ئەو جوانییە بۆ پیاوەكەیەتی و بۆ كەسی تر نییە بۆیە دروست نییە نیانی و چاكیەكەی بۆ كەسێكی تر بێت.

ئەم وەڵامە ڕوون بوو ،بۆیە بە ئاسانی لەوە گەیشتم كە بۆچی كورسی هەردوكمان بە سەرنجی سەرنشینەكان گەمارۆ درابوو .. لە خۆم پرسی ئەو بۆنەی ئەم كچە كردوویەتی بە خۆیدا بە جۆرێك سەرنج ڕاكێشە كە بۆتە هۆی قاندانی هەوای پلەیەكی فڕۆكەكە بۆیە ئەو چاو برسیانە بەم جۆرە سەیریان دەكردین؟!

دوای ماوەیەك خزمەتكاری فڕۆكەكە شەربەتی بۆ هێناین.. دراوسێكەم پەرداخێكی هەڵگرت و پێشكەش منی كرد ... ئەو هەڵوێستە سەرسامی كردم.. لێم وەرگرت دوای ئەوەی سوپاسم كرد خواردمەوە.

كەسێك بەردەوام سەیری دەكردم و بە سەرنجەكانی گەمارۆی دەدام زۆر پێی بێتاقەت بو بوم، هەتا ئەوە بوو لە كۆتاییدا سەرنجێكی بەردەوامم ئاراستە كرد و ڕوم لانەدا هەتا ناچارم كرد ڕوو وەرگێڕێ بەڵام هەستم كرد بەوەش وازی نەهێنا، جار جار لە ژێرەوە سەیری كچەكەی دراوسێمی دەكرد منیش پارچە وەرەقەیەكم هێناو لەسەرم نوسی "لە ئاوڕدانەوە ماندو نەبویت" دوای ئەوە ئیتر ئاوڕی نەدایەوە.

گه‌شته‌كه‌مان ده‌ستی پێكرد فڕۆكه‌كه‌مان به‌رز بۆوه‌ بۆ ناو ئاسمان تا چوه‌ ناو هه‌وره‌ چڕه‌كانه‌وه‌، پاش چه‌ند خوله‌كێك سه‌رنجم به‌لای ئه‌و دیمه‌نه‌ دڵفرێنه‌دا چوو ... سبحان الله العظیم ... ئه‌مه‌م به‌ ده‌نگی به‌رز ووت، دیمه‌نی ئه‌و شاخانه‌ی كه‌ له‌ هه‌وره‌كان دروست بوو بوون سه‌رنجی ڕاكێشام و سه‌رسامی كردم .

دراوسێكه‌م كه‌ لای په‌نجه‌ره‌كه‌وه‌ بوو ووتی وه‌ڵڵاهی ڕاسته‌ "سبحان الله العظیم" پاشان ڕوی قسه‌ی كرده‌ من و وتی "ئه‌م دیمه‌نه‌ هه‌ستی شاعیر له‌ بالاَدا ده‌بزوێنێ، له‌ به‌خت باشیمه‌ كه‌ بومه‌ته‌ دراوسێ‌ی شاعیرێك كه‌ توانای نه‌خشاندنی تابلۆیه‌كی شیعری جوانی هه‌یه‌ بۆ ئه‌م دیمه‌نه‌.

كاتێك به‌م جۆره‌ ده‌دوا وه‌ك ئه‌و ساته‌ نه‌مابوو كه‌ هاته‌ ناو فڕۆكه‌كه‌ ... ئه‌و عه‌بایه‌ی كه‌ دابوی به‌سه‌ر خۆیدا له‌گه‌ڵ ئه‌و په‌چه‌ ناسكه‌ی كه‌ دابوی به‌ ده‌موچاویدا كۆیكردنه‌وه‌ و كردنیه‌ ناو جانتاكه‌ بچوكه‌كه‌ی ده‌ستی.. ده‌موچاوی به‌ چه‌ند ڕه‌نگێگی جوان ڕازاندبۆوه‌، هه‌رچی قژیشی بو به‌ شێوازێكی تایبه‌ت ڕێكی خستبو كه‌ سه‌رنجی ته‌ماشاكه‌رانی بۆ لای خۆی كێش ده‌كرد .

وتم "سبحان من علم الانسان ما لم یعلم" ئه‌گه‌ر خوای گه‌وره‌ له‌ گه‌نجینه‌كانی ئه‌م بونه‌وه‌ره‌ زانستی نه‌به‌خشیایه‌ به‌مرۆڤ وا به‌ ئاسانی بوارمان نه‌ده‌بوو ئه‌م شاخه‌ هه‌ورانه‌ به‌م شێوه‌ جوانه‌ ببینین.

وتی: ئه‌مه‌ به‌ڵگه‌یه‌ له‌سه‌ر ده‌سه‌ڵات و توانای خوای گه‌وره‌.

- به‌ڵێ ئه‌مه‌ به‌ڵگه‌یه‌ له‌سه‌ر ده‌سه‌ڵاتی په‌روه‌ردگار له‌ بونه‌وه‌ردا، بونه‌وه‌رێك كه‌ په‌روه‌ردگار نهێنی گه‌وره‌ی تیا داناوه‌.. سه‌رباری ئه‌وه‌ی كه‌ یاسایه‌كی داناوه‌ بۆ مرۆڤه‌كان تا به‌هۆیه‌وه‌ ژیانیان پارێزراو بێت، و به‌ هۆیه‌وه‌

بگەنە ڕەزامەندی خواو لە سزای خۆی دوریان بخاتەوە لە ڕۆژی ووریابونەوەدا.

- ئەم گەشتە بۆ من زۆر خۆش دەبێت هەرگیز بڕوام نەدەکرد کە بە تەنها بتبینم ، دەکرێت گوێم لە هەندێ هۆنراوە بیێت.

لە ناخی دڵەوە حەزم دەکرد کە نەیزانیایە من کێم، چونکە هەندێ تێبینیم لا دروست بوو بوو دەمویست پێ بڵێم ، تۆزێ بێدەنگ بوم ... هەروا خەریکی لێکدانەوە بوم کە چی بکەم؟ ڕاستەوخۆ ئامۆژگاری بکەم و ئەوەی بۆ ڕون بکەمەوە کە چۆن کەوتۆتە هەڵەوە، یان ئەوە دانێم بۆ دوا قۆناغ .. دوای دودڵیەکی کورت بڕیارمدا ڕاستەوخۆ گفتوگۆی لەگەڵدا بکەم و ئامۆژگاری بکەم، ئەگەر ئەنجامەکەشی ببێتە کۆتایی قسەکردن لە نێوانماندا.

بەر لەوەی دەست بە قسە بکەین لە جانتاکەیدا هەندێ پەڕی ڕەنگا و ڕەنگی دەرهێنا و وتی "ئەمە هەندێ نوسینی خۆمە هەرچەندە دەزانم ئەمە لەو ئاستەدا نییە کە شیاوی سەیر کردن بێت بەڵام کۆمەڵێك هەست و دەربڕینی دەرونمە."

منیش لێم وەرگرت و بە وردی خوێندمەوە، تا بتوانم بەهۆیەوە کلیلی کەسایەتی ئەوی تیادا بخوێنمەوە، هەستەکانی هەموی خەیاڵی بون، کچێکی زۆر هەست ناسك بو خەونەکانی بە شێوەیەکی ڕوون خەیاڵی داگیر کردبوو ، بەڵام ئەوەی شوێنی تێڕامان بوو چەند دێڕە هۆنراوەیەکی منی کردبوو بە نمونە لە دڵی خۆمدا وتم:

ئەمە شتێکی جوانە لەوانەیە ئەمە ببێتە هۆیەك کە دڵی بکرێتەوە لە بەرامبەر ئەو قسانەی کە دەمەویست پێی بڵێم.

دوای خوێندنەوەی بۆچونم گۆڕی و بڕیارمدا کە ئامۆژگاریەکانم دوا بخەم و

لە جیاتی ئەوە بکەومە گفتوگۆیەکی تر لە گەڵیدا..

- کۆمەڵێك هەستی جوان و پاك لەو دەستەواژانەدا هەیە، بەڵام هیچ واتایەك یان بۆچونێك دەرنابڕێت، بەڕاستی هیچی لێ تێ نەگەیشتم ، دەتهەویست چی بڵێی؟

- (دوای ئەوەی ماوەیەك بێ دەنگ بوو) نازانم بڵێم چی؟ هەست بە دڵتەنگیەکی زۆر دەکەم بە تایبەت ئەو کاتانەی شەو دادێت ، گۆڤاری جۆراو جۆر دەخوێنمەوە لەبارەی ژنانەوە ، سەرنج لە وێنەی هونەرمەندان دەدەم .. فلان دەموچاوم بە دڵە و بالای فلانیش لەگەڵ جل و بەرگی فلان، ئەمە جۆرێکە هەندێ جار وام لێ دێت کە ئاوات بخوازم دەموچاوی هاوسەرەکەم وەك شێوەی فلان هونەرمەند بێت ... لەمانە هەمو بێزار دەبم و پاشان بە دوای فلیمێکدا دەگەڕێم کە بە دڵم بێت.. سەیری دەکەم هەست دەکەم خەو دەمباتەوە، واز لە هەمو شتێك دەهێنم و دەچمە سەر جێگاکەم لێرەدا ئەوە ڕودەدات کە ناتوانم لێکی بدەمەوە ... خەوم دەزڕێ نازانم خەوەکەم چی لێ هات ، گەشتەکەم لەگەڵ بیرکردنەوەدا دەست پێدەکات ئیتر بە نوسین هەستی خۆم دەردەبڕم.

- دوای تۆزێك لێکدانەوە هەستم کرد کە ئەم کچە توشی نەخۆشی سەردەم و هاوچەرخ بون هاتووە و پێویستی بە چارەسەرە ، پێم وت: ئەمانەی لێرەدا نوسیوتن ئەوە دەرناخات کە باست کرد.. ئەمانە کۆمەڵێك دەستەواژەی سەرنجڕاکێشن پێ دەچێت لە هەندێ نوسینی ئەملاولا بیهێنیت و پاشان بینوسیتەوە.

- لە وەڵامدا ووتی: سەیرە! تۆ تاکەکەسی کە ئەم ڕاستیە باس بکەیت، هاوڕێکانم باس لە جوانی نوسینەکانم دەکەن، هەندێك لەمانەم ناردووە بۆ

هەندێ ڕۆژنامە و بلاوبۆتەوە.. تەنانەت سەرنوسەرێك نامەیەکی سوپاسی لەسەر ئەم داهێنانە بۆ نوسیوم، من لەگەڵتدام کە واتای نییە بەلام جوانە.

- ڕاستەوخۆ لێرەدا لێم پرسی هیچ مەبەستێکت هەیە لە ژیان؟

- شڵەژاوی بە دەموچاویەوە دەرکەوت ، چاوەڕوانی پرسیارێکی لەم جۆرە نەبو ، بەر لەوەی وەلامم بداتەوە پێم ووت : سەربەستیت لە بیرکردنەوەدا؟ .. دەتوانی ژیریت لە بیرکردنەوەدا بەکاربهێنی ؟ یان لە خزمەتی ئەو گۆڤارانەدا کە باست کردن ، یان ئەو زنجیرە فلیمانەی لە کاتی بێتاقەتیدا سەیریان دەکەیت و کاتی خۆتیان پێوە بەسەر دەبەیت ... تۆ موسڵمانی؟!

- لێرەدا هەمو شتێك گۆڕا شێوازی قسەکردنی .. تەنانەت دانیشتنی سەر کورسیەکەی گۆڕانی بەسەرداهات، پێ‌ی وتم: گومان لە موسڵمانێتی من دەکەیت؟ سوپاس بۆخوا موسڵمانم و لە خێزانێکی موسڵمانم ، ژیریم سەربەستە و کۆیلەی کەس نییە، بواریشت نادەم بەم جۆرە بم دوێنی.

- ڕوی وەرگێڕا بۆ لای پەنجەرەکە وسەرنجی ئەو دیمەنە جوانەی دەدا کە لەو دیوی پەنجەرەکە بە بەرچاوماندا دەگوزەرا ، دیمەنێك کە خالقی ئاسمانەکان بۆ خزمەتی ئێمەی مرۆڤ خولڨاندبووی.

- هیچ وەلامێکم نەبو بۆ وتەکانی ، یەکێك لەو ڕۆژنامانەم هەڵگرت کە لەبەردەممدا بون، سەرقاڵ بوم بە خوێندنەوەی یەکێك لە بابەتەکانی کە لە بارەی ئیسلام و ئیرهابەوە نوسرابوو .. نوسینێکی درێژ بو پڕ بو لە هەڵە و لە درۆ ... چەند سەرسەخت و نەگبەتن ئەوانەی درۆ بەدەم خواوە دەکەن، نایشارمەوە خوێندنەوەی ئەو بابەتە وتوویژەکەی پێشوی لە بیر بردمەوە.. بە جۆریك ئاگام لەو سەرنجانە نەبوو کە بەدزیەوە دەیکردە سەر ڕۆژنامەکە، هەتا

ئەو بابەتە ببینێت کە قسەکردنی لەبیر بردبومەوە (وەك لە دوایدا پیٚی وتم) گەشتی بیرکردنەوەم بەردەوام بوو لەگەڵ ووتاری ڕۆژنامەکە.. بە دەنگی ئەو بە ئاگا هاتمەوە کاتێك لیٚ ی پرسیم: لە موسڵمان بونم گومانت هەیە؟!

- پێم وت : ئیسلام واتای چیە؟

- من منداڵم هەتا ئەو جۆرە پرسیارەم لیٚ بکەیت؟

- پەنا بەخوا تۆ کچێکی تەواو پێگەیشتوی، دەموچاوت ئارایشت دەکەیت، قژت ڕێك دەخەیت.. بە شێویەکی جوان عەبا وپەچە لە ولاٚتی خۆت دەپۆشیت بەلاٚم کە دورکەوتیتەوە لایدەبەیت وەك ئەوەی هیچ نەگەیەنیٚ پێت ... بەڵیٚ تۆ کچێکی گەورەیت بە جوانی دەتوانی ئەو بۆنە هەڵبژێری کە بە هەموو جێگایەکدا بلاٚودەبێتەوە ... کیٚ وتویەتی تۆ منداڵی؟

- بۆ بەم جۆرە توندی بەرامبەرم؟

- جاریٚ وەلاٚمم بدەرەوە ئیسلام چیە؟

- ئەو دینەی کەخوای گەورە بە محمد (صلی الله علیه وسلم) ڕەوانەی کردووە.

- ئەوەیە کە بە منالی لەبەرمان کردوە مل کەچ بون بۆ یەکتاپەرستی خوا، و گوێڕایەڵ بون بە پەرستن، و خۆڕزگارکردن لە هاوەڵ پەیداکردن.

- وەڵلاٚهی بیرت خستمەوە لە وانەی یەکتاپەرستیدا نمرەی تەواوم دەهێنا.

- ئەی مەبەست لە مل کەچ بون و گوێڕایەڵی چیە؟

- ماویەك بێدەنگ بو پاشان ڕوی تێکردم و وتی:

- سوێندت دەدەم بەخوا بۆچی بەم جۆرە مامەڵەم لەگەڵدا دەکەیت، بۆ خراپەم لەگەڵ دەکەیت لە کاتێکدا خراپەم لەگەڵ نەکردویت؟

- لە وەڵامدا وتم : زۆر بەلامەوە سەیرە کە ئەم وتویژە بە خراپ لێك دەدەیتەوە ؟ ئەو قسانە چ خراپەیەکی تێدایە؟

- من زیرەکم و دەزانم مەبەستت چیە تۆ بە شێوەیەکی ناڕاستەوخۆ سەرزەنشتم دەکەیت و تاوانبارم دەکەیت

- ئەی تۆ موسڵمان نیت؟

- ئەم پرسیارە بۆ دەکەیت ؟ موسڵمانم بەر لەوەی تۆ بناسم ، تکا دەکەم جارێکیتر قسەم لەگەڵ مەکە .

- داوای لێبوردن دەکەم، پەیمانت دەدەمێ دوای ئەمە قسەت لەگەڵ نەکەم.

- دوبارە خۆم سەرقاڵ کردەوە بە خوێندنەوەی ئەو بابەتەی کە دەستم پێکردبوو، خاوەنی بابەتەکە هێرش دەکاتە سەر ئیسلام.. باسی لەوە دەکرد کە ئیسلام دینی تۆقاندنە و شوێنکەوتوانی بانگەواز بۆ تیرۆر دەکەن، لەدڵی خۆمدا وتم: سبحان الله لە هەموو لایەکەوە هێرشە و موسڵمان وەك بەرخ سەردەبڕدرێت ..کەچی پێشیان دەوترێت تۆقێنەر، چومە لاپەڕەیەکی تر و هەواڵێکی موسڵمانانی کشمیری تیابوو لەگەڵ وێنەی ژنێك کە منداڵێکی بە باوەشەوە بوو.. لەژێر وێنەکەدا نوسرابو (دەست درێژیان دەکەنە سەر و بەزۆر لەچکەکانمان پێ لادەبەن مردنمان پێ خۆشترە لەوە.)

- ئەوەم لە یاد چوو بوو کە هاوسێکەم لە ژێرەوە سەرنجی ڕۆژنامەکە دەدات، لە پڕ وتی: ئەوە چی دەخوێنیتەوە؟

- منیش ڕۆژنامەکەم خستە بەردەستی و وێنەکەم پیشاندا.. بێ دەنگی نێوانمان بەردەوام بوو، خزمەتکارەکە هات خواردنی بۆ هێناین.. بێدەنگی هەر

بەردەوام بوو، دوای گەڕانێکی کەم بەناو فرۆکەکەدا هاتمەوە جێگاکەی خۆم، هەر کە دانیشتم یەکسەر وتی:

- چاوەڕێ نەبوم بەم دڵ ڕەقیە مامەڵەم لەگەڵ بکەیت!

- نازانم لای تۆ واتای دڵ ڕەقی چییە؟ من چەند پرسیارێکم لێ کردویت و چاوەڕوان بوم وەڵامم بدەیتەوە، ئەی تۆ باسی ئەوەت نەکرد لە خۆت دڵنیایت ئیتر بۆ پرسیارەکانم توڕەیان کردیت؟

- هەست ئەکەم تۆ ڕقت لێمە ؟

- پێم ڕاگەیاند: ئەو هەستەت لە کوێوە بۆ هاتووە؟

- نازانم

- بەڵام من دەزانم.. سەرچاوەی ئەم هەستە ناخی دەرونتە، ئەوە هەست کردنە بەتاوان و کەوتنە ناو گوناە ، تۆ لە دوو فاقیدا دەژیت ...

زۆر بە توندی قسەکانی پێ بڕیم : ئەوە تۆ دەڵێی چی؟ من نەخۆشی دەرونیم هەیە؟

– تکا دەکەم توڕە مەبە با قسەکانم تەواو بکەم، تۆ لە دوو فاقیەکی خراپ دایت، تۆ لە ناوەوە ڕووخاویت ئەمە گومانی تێدانییە بەڵگەشم هەیە و ناتوانی ئینکاری بکەیت.

بەشڵەژاویەوە وتی : چییە ؟

– تۆ دەڵێ ی موسڵمانم، ئیسلامیش قسە و کردارە، لە سەرەتای گفتوگۆکەدا بۆم باسکردی کە گرنگترین بنەمای موسڵمانێتی ملکەچ بونە بە فەرمانەکان، دەپرسم تۆ بەو جۆرەیت ؟

ماوەیەك بێدەنگ بوم هەتا بواری بدەم ئەگەر توانجێکی هەبێت لەسەر قسەکانم، بەڵام بێدەنگ بوو تەنانەت قسەیەکیشی نەبو... لەوە گەیشتم کە

دەیویست گویٚ بگرێت ، منیش بەردەوام بوم :

– پۆشاکە باڵاپۆشەکانت کە بە کۆیلەیی خراونەتە ناو جانتاکەتەوە بەڵگەیە لەسەر قسەکانم.

لە وەڵامدا کە توڕەبونی پێوە دیار بوو وتی:

– ئەمە تەنها شێوە و ڕوکەشە.. تۆش هەر ئەوەت بەلاوە گرنگە، گرنگ جەوهەرە...

– جەوهەر کامەیە؟ ئەوە نىیە تۆ شلەژایت لە زانینی واتاکانی ئیسلام لە کاتێکدا باوەڕداری، چونکە ڕووکار پەیوەندیەکی گەورەی هەیە بە ناوەڕۆکەوە یەکیان ئەویتر تەواو دەکات، ئەگەر ئەو پەیوەندیە تێکچو ژیانی مرۆڤ تێك دەچێت.

– تۆ وادەزانی هەرکەسێك عەبا و لەچك و پەچە پۆشیٚ کەسێکی پاك و چاکە؟

– نەخێر مەبەستم ئەوە نىیە ، بەڵام جیٚ بەجیٚ کردنی باڵاپۆشی فەرمانێکی شەرعە، ئەگەر ناوەڕۆك و دەرەوە پێکەوە گونجان، ئەوە موسڵمانێتی ڕاستەقینەیە، بەڵام ئەگەر پێچەوانە بوو ئەوە کەسایەتیەکی ناهاوسەنگ دەردەچێت، بۆیە ناوەڕۆك گرنگە لەگەڵ ئەوەی لابردنی باڵاپۆش زۆر ئاسانە بەڵام باوەڕ لاسەنگ دەکات، ئێستا ئەو دەستەواژەیەت بیردەهێنمەوە کە لەو ڕۆژنامەیەدا هاتووە لەسەر ئەو ژنە کشمیریە ئایا نەیوت مردن ئاسانترە لەلای لەسەر لابردنی باڵاپۆشەکەی، لەبەر چی مردن ئاسانترە؟

چونکە ئەو باوەڕەی هەیەتی بەخوا وەهای لیٚ کردوە کە ملکەچ بێت بەفەرمانەکانی، کە لەوەوە واتای ئیسلام جیٚ بەجیٚ دەبێت.. بەجۆرێك کە

ڕوکار و ناوەرۆك یەك بگرنەوە، ئەم یەکگرتنەوەیە وادەکات کە موسڵمان واتای فەرمودەکەی پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) جێ بەجێ بکات (لایؤمن احدکم حتی یکون هواه تبعا لما جئت به) رواه النووی في الاربعین. بالآپۆش لەلای تۆ لە سنوری عادەت و نەریت لانادات.. بۆیە زۆر ئاسانە بەلاتەوە کە فرۆکەکە لەسەر ئاسمانی وڵاتەکەت دورکەوتەوە بەبێ بیرکردنەوە لایبەریت، بەڵام ئەگەر لە ڕوانگەی باوەڕ بە خواوەوە بێت لەبەر ئەوەی فەرمانێکی شەرعە بۆیە لەهەر کۆمەڵگایەك بێت جیاوازی بۆت نایێت ، ئەوکاتە بەم ئاستە بەلاتەوە ئاسان نەدەبوو.

دوفاقی لە کەسایەتیدا (بەڕێزم) بۆ خۆی کێشەیە، ئەزانی هۆکەی چیە؟

وامزانی وەڵام دەداتەوە بەڵام بێدەنگ بوو.. وەك ئەوەی ئەو چاوەڕوان بێت کە من وەڵام بدەمەوە، پێم وت:

خۆ دانە دەست باو و نەریتی کۆمەڵگا بەبێ گوێدانە فەرمانەکانی شەرع.. کە ئەمە لاوازی چاودێری ناوەوە دەگەیەنێت لەلای مرۆڤ، خراپیەکانی ئەمەش تێك شکاندنی موسڵمانە لە ناوەوە، کە تێکشکا ئەوا ئارەزواتی نەفس زاڵ دەبێت بەسەریدا و شەیتانیش یاری پێ دەکات و هەروا دەمێنێتەوە هەتا هاوسەنگی خۆی لەدەست دەدات...

بێ دەنگیەکی قوڵ باڵی بەسەردا کێشابو و هیچی نەوت، دوای کەمێك جانتاکەی هەڵگرت و بەرەو دوای فڕۆکەکە ڕۆیشت ... تۆ بڵێی زۆر بیزارم کردبێت بەقسەکانم ... تۆبڵێی سەرکەوتو بوبم لەباسکردنەکەدا؟ لەڕاستی دا نەمدەزانی ئەوەی وتومە تاچ ئاستێك ئیجابی یان سلبیە، بەڵام دڵنیا بوم لەوەی کە توانیم توڕەبونەکەی هێواش بکەمەوە، لە خوا پاڕامەوە کە لێم خۆش بێت و ڕێنمویی ئەویش بکات و بەردەوامان بکات لەسەر هەق و ڕاستی.

پاش كەمێك هاتەوە جێگاكەی خۆی.. بەڵام چۆن و بەچ شێوەیەك؟ ئەوەی لـەبیر وهۆشدا نەبو ڕویدا، جلـەكانی پۆشتە كردبۆوە ... زۆر دڵخۆش بوم بەو دیمەنە !

پێی وتم :

بەخشینی ئەم كورسیە بەمن بەزەیی خوا بوو، تۆ ڕاستت كرد من لـە ناوەوە ڕوخابوم، ئەو دو فاقیەی كە باست كرد بۆتە سیما و دیاردەیەك لـە لای زۆر لـە كچ و كوڕی موسڵمانان، ماڵوێرانی بۆمان لـەو بێئاگاییەی تیایداین، ژنانی ئێمە لـەخەو وخەیاڵدا دەژین.

لێت ناشارمەوە كە باس وخواسی ژنانی ئێمە لـەماڵ و ئاڵتون و جل و بۆن تێپەڕ ناكات، سەرباری بونی گۆرانی و فلیم و گۆڤاری ئافرەتان كە جگە لـە بێ ئاستی و بڵاوكردنەوەی بەدڕەوشتی هیچی تری تیادا نىیە، ئێمە بۆ وەهاین ؟ بەڕاست ئێمە موسڵمانین؟

ئایا من موسڵمانم ؟ پرسیارەكەت بریندارکەر بوو بەڵام هەق بوو.. چونكە تۆ بەڕاستی كردارەكانی منت بینی، كە هاتمە ناو فڕۆكەكە باڵاپۆش بوم.. بەڵام كە دەستی بەفڕین كرد جلـەكانم لابرد.. باوەڕم بەو كارەش هەبو كە كردم یان واهات بە مێشكمدا كە قەناعەتم هەیە، لـە كاتێكدا ئەوەی كە كردم بەڵگەیە لـەسەر دوو فاقی وڕوخان، من سوپاست دەكەم سەرەڕای ئەوەی كە زۆر تەنگت پێ هەڵچنیم بەڵام ڕێگات نیشان دام، كە بگەڕێمەوە لای خوا و پەشیمان ببمەوە و تەوبە بكەم، دەمەوێ ڕاوێژێكت پێ بكەم ... لـەو كاتەدا كە گوێم لـە قسەكانی گرتبوو و لـە ناو دەریای خۆشیدا مەلـەم دەكرد ...

– بەڵی فەرموو گوێم لێتە ؟

- لـه هاوسەرەكەم دەترسم
- بۆ لێ ی دەترسی، ئەو لـه كوێیە؟
- لـه فڕگه چاوەڕوانی گەیشتنم دەكات و بەم جۆره دەمبینێ.
- ئەمه شتێكه بەختەوەری دەكات.
- نەخێر دوا جار كه قسەم لـەگەڵ كرد.. لـه تەلـەفونەكەدا پێ ی وتم "ئاگاداربه بەم جلانەوه لـه فڕگه دانەبەزی، لـەبەردەم خەڵكدا شەرمەزارم نەكەیت" بێگومانم كه زۆر تورە دەبێت.
- ئەگەر خوات ڕازی كرد تورە بونی ئەو لـەسەر تۆ نیەیه، پاشان دەتوانی بە ئارامی و بڕوا به خۆبونەوه وتووێژی لـەگەڵدا بكەیت .. به دوری مەزانه كه وەڵامت بداتەوه و ڕازی بێت، ئامۆژگاریت دەكەم كه زۆر گرنگی پێ بدەیت هەتا بەختەوەری و سەرفرازی ڕۆژی دوایی لـه دەست نەدات.

هیچ وەڵامێك یان قسەیەكی نەبوو..

بێدەنگیەك دروست بوو ...

لـەو كاتەدا وێنەی پیاوێك هاته بەرچاوم كه ڕێگایەكی وەها پیشان ژنەكەی دەدات، چۆن وادەكات و داوا لـه ژنەكەی دەكات كه خۆی ڕوت بكاتەوه بۆ كەسانی چاوبرسی بۆ گورگه برسیەكان ... باشه ئەمه ڕەوایه؟! كەسێك موسڵمان بێت و ئەوه بكات ؟! لاحول ولا قوه الا بالله

شارستانیەتی ئەم چەرخه نەوەی موسڵمانان یەك به یەك دەدزێ و ئێمەش لـێیان بێ ئاگاین.. بەڵكو لـه نەفسی خۆشمان بێ ئاگاین .

بەگەیشتنمان بۆ فرۆكەخانه دوای ئەو گفتوگۆ گەرمه مەراسیمی گەشتەكەمان دوایی هات، كاتێك هاوسەرەكەی پێشوازی لێ كرد نەمبینی، بەڵكو دەنگ و ڕەنگی چووه ناو جیهانی بیرچونەوه وەك هەزارەها خەڵك و

ڕوداوو و هەڵویست كە ڕۆژانە بەسەرماندا دێت..

ڕۆژێك لە نوسینگەكەم سەرقاڵ بوم بە خوێندنەوەی كتێبی (المراءة العربية وذكورية الاصالة) ی (منى غضوب) ، سەرسام بوو بوم بەو تێكەڵ كردن و سەفسەتە وسەرلێ شێواوییە لە بیر و زماندا.. كە ئەم كتێبە بچوكە دەیگرتە خۆی، لەو كاتەدا هەستێكی قوڵ دایگرتم لەخەم و لە ئازار لەسەر واقیعی ئەم گەلە.

لەو كاتە تەماوی و تاریكیەدا كەسێك نامەیەكی بۆ هێنام بەسەر قاڵیەوە لێم وەرگرت، دەمویست لە دەست ئەو ئازارە ڕزگارم بێت كە لەناو دڵمدا هەڵگیرسابوو بەهۆی ئەو كتێبە ڕەشەی كە خاوەنەكەی هەوڵی دەدا ئافرەتی پێ لە مێیەتی خۆی بسڕێتەوە، كاتێك نامەكەم كردەوە .. دەبێت كێ ناردبێتی .. نوسرابو خوشكت بۆ خوا دایكی محمد – دوعای خێرت بۆ دەكات .. دایكی محمد كێ بێت؟

كەوتمە خوێندنەوەی نامەكە بەڕاستی شتێكی كوتوپڕ و خۆش بوو.. ئەو كچەیە بوو كە لەناو فرۆكەكەدا وتوێژەكەمان كرد، كە چیرۆكەكەی چوو بوە باری بیر چونەوە !

باشترین ڕستە كە لەو نامەیەدا خوێندمەوە (لەوانەیە ئەو كچەت لەیاد بێت كە ڕۆژێك لە گەشتی فڕۆكەیەكدا لە كورسی تەنیشتت بووە دراوسێت، مژدەت دەدەمێ ڕێگای خۆم زانی بەرەو چاكە.. هەڵوێستی من كاریگەری هەبو لەسەر هاوسەرەكەم .. تۆبەی كرد لە زۆرێك لەو تاوانانەی كە دەیكرد.

پێت دەڵێم چەند جوانە پابەند بون لەسەر بنەمای تێگەیشتن بۆ ئەم ئاینە گەورەیە، هۆنراوەكەشتم خوێندەوە : ضداه يا اختاه .. تێگەیشتم چیت ئەوێت!

والسلام.

دوای تەواو بونم لە خوێندنەوەی نامەکە نەمتوانی وێنەی ئەو خۆشیە بنەخشێنم کە چەندە دڵخۆش بوم ، چەندە مژدەیەکی خۆش بو.

کتێبەکەی دەستم هەڵدا و ئەم ئایەتەم خوێندەوە:

{يُرِيدُونَ أَن يُطْفِؤُواْ نُورَ اللّهِ بِأَفْوَاهِهِمْوَيَأْبَى اللّهُ إِلاَّ أَن يُتِمَّ نُورَهُوَلَوْ كَرِهَ الْكَافِرُونَ} التوبة ٣٢

نامەیەکم بۆ دایکی محمد نوسی و خۆشی خۆم بۆ دەربڕی، لە بەرامبەر ئەو نامەیەی بۆی ناردبوم.. هەروەها بۆ ئەو مژدەیەی کە پێی دابوم چەند دێڕێکم لەو هۆنراوەیە بۆ نوسی :

ضداه يا اختاه ما اجتمعا الهدى والفسق والصد

والله ما أزرى بأمتنـــا الا ازدواج مـــاله حد

بەڵام کە ویستم نامەکە بنێرم بۆم دەرکەوت ناونیشانی نەنوسیبوو، بۆیە لە نێوان پەڕەکانم هەڵمگرت بەڵکو ڕۆژێك پێی بگات.

سبحانك اللهم و بحمدك اشهد ان لا اله الا انت استغفرك و اتوب اليك.

## كچە خوێندكارێكی زانكۆ

بەردەوام خەونم بەوەوە دەدی كە بچمە زانكۆ و ببمە خاوەن بۆچونی خۆم و گوێ بە خەڵكی نەدەم، بەو جۆرە توانیم قۆناغی ئامادەیی تەواو بكەم وبەهۆی نمرە باشەكانمەوە بچمە زانكۆ.

یەكەم ساڵی خوێندنی زانكۆ دەستی پێكرد بەڵام مەبەستی من تەنها خوێندن نەبوو، بەڵكو گەڕان بوو بە دوای هاوەڵانێك كە بیركردنەوەیان وەك خۆم بێت ، كەسانێك كە لە خەمی كرانەوە و هاوچەخێتیدا بژین و وەك خۆم كار بۆ سەربەستی بكەن .

لەناو دەستە خوشكەكانم هەندێ هاوەڵم پەیدا كرد و پەیوەندیەكی باشم لەگەڵدا گرتن، قسەكانمان لەسەر بابەتی بێ كەڵك و سادە بوو وەك مۆدە و جل و بەرگ ، كەرەسەی جوانكاری ، كەناڵە ئاسمانیەكان و فلیم و ئەو زنجیرە نواندنانەی كە هەبون، كلیپ و سی دی و گۆرانی ، پڕوپاگەندە و درۆ، غەیبەت و دوو زمانی كردن، گاڵتە كردن و بەكەم زانینی كەسانی تر و كۆمەڵێ شتی تری لەم جۆرە.

پەیوەندی نێوانمان لە ماڵەوە هەرچی باوكم بوو سەرقاڵی بازرگانی بوو، براكانم هەركەس بەجۆرێك و بەرێگای خۆی، هەرگیز ووشەیەكی ئامۆژگاری یان ڕەخنەم لێ نەبیستون، لە جیهانێكدا دەژیام خۆم دروستم كردبوو، نەمدەویست لێ ی دەرچم، وام لێك دەدایەوە كە من هیچ كارێكی هەڵە ناكەم هەتا لەگەڵ دەستە خوشكەكانمدا بم.

ڕۆژێك لەبەر دەرگای زانكۆ چاوەڕوانی شوفێرەكەم دەكرد، كچێك بەرەو ڕوم دەهات، شێوەی ئاكار و پۆشاكەكەی دەچووە سەر ئەو جۆرەی كە دایكم

و نەنکم پەیڕەویان لێ دەکرد، جلەکانی پۆشتە بوو و هیچ بەشێکی لەشی دیار نەبوو.

– سلاو ..

پاشان دەستی درێژ کرد و منیش دەستم برد بەڵام خێرا گێڕامەوە سەرنجمدا دەستکێشی لە دەستدا بوو، پێم ووت:

– وەك ئەوەی پێویستیەکت هەبێت؟

– لە ڕاستیدا جلەکانت سەرنجی ڕاکێشام .. ویستم پرسیار لە مۆدێلەکەی بکەم.

منیش زۆر بە دڵنیاییەوە ووتم : فەرەنسیە، ئێستا تازەترین مۆدێلە کە هاتبێتە بازاڕەوە.

پێی ووتم: واگومان دەبەیت، ئەوانەی دیزاینی ئەم جۆرە پۆشاکانە دەکەن موسڵمانانن؟

پێم ووت:مەبەستت چیە ؟

– ئەی نازانی کە جلی شەرعی مەرجی هەیە، دەبێت هەمو لەش داپۆشێت، مەبەست لە پۆشینی دەرخستنی جوانی نەبێت، تەسك نەبێت و لە جلی پیاوان نەچێت، لە پۆشاکی بێ باوەڕان نەچێت، بۆ خۆدەرخستن نەبێت، تەنك نەبێت و نەبێتە هۆی سەرنج ڕاکێشانی کەسانی تر، ئەگەر سەرنج بدەیت جلەکانت پێچەوانەی زۆربەی مەرجە شەرعیەکانە و پڕیەتی لە نەخش و ڕازانەوە، تەسکەو تەنکە و لە پۆشاکی بێ باوەڕان دەچێت وەك دەبینی مەچەك قۆڵت دیارە .

پێم وت: بەسە بەسە.. ئێوە بەردەوام لەسەر بۆچونە توندەکان کاردەکەن، لەناو زانایاندا هەیە کە ئەم جۆرە پۆشاکە بە دروست نازانێ.

– خوشكی من مەسەلەكە قسەی فلاّن و فیسار نی یە چونكە ڕاستی بە پیاواندا ناناسرێتەوە، هەموان قسەیان وەردەگیرێ و بەرپەرچ دەدرێتەوە جگە لە پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) ئەوەتا پێغەمبەری خۆشەویست (صلى الله عليه وسلم) دەفەرموێت (صنفان من اهل النار لم ارهما، قوم معهم سياط كأذناب البقر يضربون بها الناس، و نساء كاسيات عاريات، مميلات مائلات، رؤوسهن كأسنمة البخت المائله، لايدخلن الجنه، ولا يجدن ريحها و ان ريحها ليوجد من مسيرة كذا و كذا) رواه المسلم.

زانایان دەڵێن: هەركەسێك لەم پۆشاكەی تۆ لەبەر بكات لەكۆمەڵی دووهەمە كە لە فەرمودەكەدا باسكراوە، هەروەها دەفەرموێت (صلى الله عليه وسلم) (أيما أمراءة تطيبت، ثم خرجت الى المسجد، لم تقبل لها صلاة، حتى تغتسل) رواه ابن ماجة

ئەم بۆنە خۆشەت منی كەمەندكێش كرد! ئەی دەبێت بۆ پیاوان و لاوان چۆن بێت ؟

بالاّپۆشی.. خوشكی من پاكێتی یە و پاراستنی ژنە لە چاوی كەسانی داوێن پیس.. كەسانی بێ شەرم وحەیا، بالاّپۆشی خوشكەكەم...

ئا لەوێدا قسەكانم پێ بڕی و بەتوندی ووتم:

– بەسە .. بەسە .. تەواو ..دوایی لەو بابەتە دەكۆڵمەوە، پاشان تۆزێك لێ ی دوركەوتمەوە .. ئەم هەڵوێستە زۆر كاری تێنەكردم، وەك هەر یەك لەو هەڵوێستانەم دانا كە بەردەوام توشی دەبوم لە خوێندنگاكەم لەلایەن مامۆستاكان و هەندێ لە خوێندكارەكانی وەك ئەم كچە.

جارێك لە نزیك كافیتریادا لەگەڵ هاوڕێكانم دانیشتبوین، سەرقاڵی وتوێژ

بوین بە دەنگی بەرز و پێدەکەنین، لەوەش زیاتر تۆمارێکی بچوکمان لە تەنیشت خۆمان دانابوو، گۆرانیەکی قەرەباڵغمان خستبوە سەر لەوانەی کە بەلامانەوە خۆش بوو، بەڵام ئەم جارە وا دیار بوو کە دەنگی تەسجیلەکە بەرز بوو .

کچێك هات بۆ لامان، سەلامی لێ کردین، داوای کرد کە دەنگی تۆمارەکە کز بکەین.. بۆ ئەوەی بتوانێ قسەمان لەگەڵ بکات، ئێمەش کزمان کرد، کچەکە زۆر جوان بوو، جلەکانی ئاماژەی بە هەستێکی بەرز دەدا، لەگەڵ ئەوەشدا هیچ ڕازاندنەوە و دیاردەیەکی سەرنج ڕاکێشی پێوە دیار نەبوو، بەڵام ئەوپەڕی ووردی و ناسکی و گونجان بە ڕەنگەکانیەوە دیار بوو.

لەکاتێکدا کە سەرسامی جوانی خۆی و جلەکانی بوو بووم چاوەڕوانی قسەکانی بوم، دەستی کرد بە سەرزەنشت کردنمان لەسەر گوێ گرتن لە گۆرانی.. ئامۆژگاری کردین کە گوێ لەکاسێتی قورئان و شتی بە سوود بگرین.

سەرسام بووم کە چۆن ئەم کچە هاوچەرخە لەم باسانە دەدوێ، بەڵام ئەم جارە کاریگەری هەبوو لەسەرم بۆیە بڕیارمدا بەهێمنی بیر بکەمەوە و بەدوای زانیاریە ئاینیە پێشووەکانمدا بگەڕێم، پێم ووت:

ئێمە هەندێ جار گوێ لە قورئان دەگرین، بەڵام ئەمە نابێتە ئەوەی کە بوار نەدەین بە دەروونمان و گوێ لە گۆرانی و مۆسیقا نەگرین..

ووتی: ڕێگری زۆر هەیە قورئان و گۆرانی نابێت لەیەك دڵدا کۆبێتەوە، ئەگەر هەر لایەك لەناو دڵدا جێگای بۆوە ئەویتر دەکاتە دەر.

وتم: ئەمە بۆچونی خۆتە، نابێت بۆچونەکانت بەسەر خەڵکدا بسەپێنی، ئێمە حەزمان لە قورئان هەیە و حەزیشمان لە گۆرانی هەیە.

ووتی: بۆ ئەوەی ڕاستی قسەکانم بسەلمێنم، دەمەوێت هەواڵم بدەیتێ یان

هەركامتان بێت، دوا جار كەی بوو كە گەڕان بە دوای ئیزگەی قورئانی پیرۆزدا و گوێتان لێگرت؟

هیچ وەڵامان نەبوو، هەموو نقەمان لە خۆمان بڕی.. لەگەڵ ئەوەشدا دەنگی خۆ بە زل زانین و خۆ گەورە كردن لە ناوماندا بەرز دەبۆوە .. یەكێك لە ئێمە پێی ووت:

– بۆت نی یە سەرزەنشتمان بكەیت لەسەر ئەوەی دەیكەین، خۆ ئێمە هیچمان لە كۆلیژی شەریعە نین هەتا ئەم ئامۆژگاریانەمان بكەیت.

لە وەڵامدا وتی: ئایا یاساكانی ئیسلام تایبەتە بە كارمەندان و خوێندكارانی كۆلیژەكانی شەریعە.. ئەوانی تریش چی دەكەن بە كەیفی خۆیان؟

ووتم: نەخێر مەبەست ئەوە نەبوو، بەڵكو مەبەستی لەوە بوو كە بڵێ گۆرانی حەرام نی یە و بەڵگەش نی یە لەسەر حەرام بونی.

– نەخێر بەڵگە زۆرە خوای گەورە دەفەموێت {وَمِنَ النَّاسِ مَن يَشْتَرِي لَهْوَ الْحَدِيثِ لِيُضِلَّ عَن سَبِيلِ اللَّهِ بِغَيْرِ عِلْمٍوَيَتَّخِذَهَا هُزُواً أُولَئِكَ لَهُمْ عَذَابٌ مُّهِينٌ} لقمان٦

ئیبن مەسعود دەفەرموێت: مەبەست لە لهو الدیپ: گۆرانی یە، هەروەها پێغەمبەری خۆشەویست (صلى الله عليه وسلم) دەفەرموێت (ليكونن من امتي اقوام يستحلون الحر (الفروج اي الزنى) و الحرير والخمر والمعازف) رواه البخاري.

معازف بریتی یە لە گۆرانی و مۆسیقا.

كاتێك هاوڕێكانم سەیریان كرد ناتوانن وەڵامی بدەنەوە، یەكێكیان وتی: واز لە قسەكردن بێنن لەگەڵ ئەمانەدا، پاشان ڕوی تێكرد و وتی: قسەكانت پێ

برِین، وابزانم ئامۆژگاریەکەت کۆتایی هات، ئێستا وازمان لێ بهێنە و برۆ بەلای کاری خۆتەوە...

"داوای لێبوردن دەکەم .. بەلاّم بیرتان نەچێت کە ئەم کارەی ئێوە پێچەوانەی یاسای زانکۆیە، پاشان رۆیشت ...

حەزم نەدەکرد ئەم کچە جوانە بەم وشکیە بەر پەرچ بدرێتەوە کە بەلْگە بوو لەسەر لاوازی ئێمە لە بەردەم بەلْگە بەهێزەکانیدا، حەزم دەکرد گفتوگۆی لەگەلْ بکەم و بیسەلمێنم کە گۆرانی حەرام نی یە، بەلاّم چۆن لە کاتێکدا کە ئەو بەلْگەی پیێ یە بە ئایەت و فەرموودە لەسەر حەرام بوونی؟!

کچەکە ڕۆیشت، یەکێك لەهاوڕێکانم دەستی برد و دەنگەکەی زیاد کردەوە، پێکەنین جارێکی تر دەستی پێکردەوە.

لە ڕۆژانی داهاتودا لە کۆلیج لەگەلْ ئەم کچە یەکتریمان بینیەوە، هات بۆ لام و سەلامی لێکردم، ویستی داوای لێبوردن بکات بەلاّم من داوای لێبوردنم کرد لەسەر کاری هاوەلْەکەم، دوای ئەوە زانیم کە لە هەمان ئەو بەشەی من دەخوێنێت، سەرسام بوم پێم ووت : وامزانی لە یەکێك لە کۆلیژەکانی شەریعە دەخوێنی.

- بۆچی؟

- چونکە زانیاری و ڕۆشنبیری شەرعیت لە ئاستێکی بالاّدایە، ئایا ئەمە کارناکاتە سەر ئاستی خوێندنت؟

- هەرگیز، چونکە کاتەکانم ریێك دەخەم، ئەمەش وای لێکردووم کە نرخ و گرنگی کات بزانم ، هەروەها ئینگلیزی دەزانم و لە زانستی کۆمپیوتەر شارەزام، کە باشترین وانەن لە پسپۆڕیەکەمان.

هەروەك هەندێك وانە بە خوێندکارەکان دەلێمەوە، ئەگەر پێویستیت هەبوو

پێم بڵێ.

بەو پەڕی سەرسامی و گەورەییەوە لێم دەڕوانی، خۆم بە بچوك دەهاتە بەرچاو، ئەو دەتوانێ وانەی ئینگلیزی و کۆمپیوتەر بڵێتەوە.. بەڵام ئێمە خەریکی پێکەنین و گۆرانی وتنین ، ئەمە ئەو هاوچەرخێتی یە کە خەوم پێوە دەبینی؟!

وام هەست دەکرد کە ئەم کچە بە شێوەیەکی تایبەت گرنگیم پێ دەدات و دەیهەوێت پەیوەندی دۆستانەم لەگەڵدا بگرێت، لە دەروندا وتم :چۆن بتوانم ئەو پەیوەندیە دروست بکەم، لە کاتێکدا کە ئەو بەردەوام باس لە حەلاڵ و حەرام دەکات، ئەمە ئەو هەستەی لا دروستکردم، کە من هێشتا خوێندکارم لە ناوەندی یان ئامادەیی .. واز لەمانە بهێنە ئەوانە نازانن کەوا ڕۆژگار گۆڕاوە و مرۆڤ پێویستە بەپێی ئەو چەرخە بژی کە تیایدا هاتۆتە بوون.. بەسە دووبارە کردنەوەی ئەم قەوانە سواوە .. هاوچەرخی .. مەدەنی .. پێشکەوتن .. بەرز بونەوە، وەڵڵاهی ئەم دیمەنە هاوچەخانەی کە تیایدا دەژین.. جگە لە پانتۆڵێکی تەسك و تەنورەیەکی کراوە و پێڵاوی پیاوان و دەموچاوێك کە لە بەهلەوانەکان دەچێت هیچی تر نییە.

ئەو زمانی ئینگلیزی و کۆمپیوتەر دەزانێ ، ئەو لە من مەدەنی ترە.. شارەزاترە.. پێشکەوتوترە.. لەوەش زیاتر پابەندە بە ڕێنمایی دینەکەیەوە، توانیویەتی هەردوو باشەکە لای خۆی کۆبکاتەوە، ئەوە چییە من چی دەڵێم ؟

بەم ئاستە کەوتومە ژێر کاریگەری ئەو کچەوە؟ کوا بۆچونەکانم لەسەر داهاتوو؟ بیرکردنەوە تایبەتەکانم، ئەو سەربەستیەی کە بەردەوام بەدواییدا دەگەڕام؟ نەخێر، نەخێر دەبێت خۆم لەم کچە ڕزگار بکەم هەتا ژیانم تێك

نەدات.

دوای ئەوە لە هەوڵی ئەوەدا بوم کە نەیبینم و نەمبینێت، ئەگەر لە دورەوە بمبینیایە بەرێگایەکی تردا دەرۆیشتم بۆ ئەوەی نەمبینێت، بەم جۆرە پەیوەندی جارانم وەك خۆی لەگەڵ کچەکانی هاورێم بەردەوام بوو، لەگەڵ ئەوەی کە وێنەی ئەم کچە و باوەڕ بونی بە خۆی و رۆشنبیریە زۆر و جۆراو جۆرەکەی، هەروەها بونی هەستی هاوچەرخێتی تیایدا، بەردەوام و لەنێوان ماوەیەك و ماوەیەکی تر دەهاتەوە بیرم.

کات و ساتی راستەقینە هاتە پێش، نەخۆشیەکی گرانم گرت، بەهۆیەوە لە نەخۆشخانە خەواندیانم و ماوەیەکی زۆر مامەوە، لەو ماوەیەدا زۆر بیری هاوەڵەکانم دەکرد.. حەزم دەکرد بە بینینیان دەکرد .. بە مەبەستی زانینی دوا هەوڵی کۆلیژ و ئەو وانانەی کە لە کیسم چوو بون.

دوای تێپەڕ بونی هەفتەیەك یەکێکیان هاتە لام، داوای لێبوردنی ئەوانی تری پێگەیاندم کە ناتوانن بێن بۆ لام.. منیش داوام لێکرد کە وێنەیەك لە وانەکانم بۆ کۆپی بکات و بۆ بهێنێ، ئەویش بەڵێنی ئەو کارەی پێ دام.

بەوپەڕی ئارامیەوە چاوەڕوانی هاتنی وانەکانم دەکرد، بەڵام هیچ کام لە هاورێکانم نەهاتن بۆ لام لە دوای ئەو داوا کردنەوەیەوە!!

هاورێیەتی سوودی چی یە ئەگەر بەرهەمی نەبێت، بە تایبەت لە کاتی نارەحەتی و تەنگانەدا؟ ئەی هاورێ بۆ تەنگانە نییە؟ هەفتەی دوای ئەوەش هەر چاوەڕوان بووم، بەڵام بێ سوود بوو .. پاش دوو رۆژ هەواڵیان پێ دام کە کچێك دەیهەوێت سەردانم بکات واتێگەیشتم کە یەکێك لە دەست خوشکەکانمە و وانەکانی بۆ هێناوم.

داوام لە پەرستارەکە کرد بێتە ژوور، شتێکی چاوەڕوان نەکراو بوو! ئەوەی

هاتە ژوور ئەو کچە بوو کە لەبەردەم دەرگای زانکۆدا گفتوگۆی لەگەڵ کردم لەسەر پۆشاکەکەم، سەرسام بووم بەهاتنەکەی، چۆن زانیویەتی کە من نەخۆشمو لەبیمارستانم، کاتێك پەچەکەی لاداو لە تەنیشتمەوە دانیشت زانیم ئەمە هەمان ئەو کچە بوو کە لەنزیك کافیتریاکە ئامۆژگاری کردین ئەو کاتەی دەنگی تۆمارەکەمان بەرز کردبۆوە، هەمان ئەو کچەیە کە لەبەشەکەی خۆم دەخوێنێ.

ئەو کچەیە کە جوانیەکەی لە لایەك و ڕۆشنبیریەکەی لە لایەکی ترەوە سەرسامی کردبووم، ئەو کچەی کە خاوەنی هەستێکی جوان و ناسك بوو لە هەڵبژاردنی جلەکانی و لەهەمان کاتدا خاوەنی کەسایەتیەکی بەهێز بوو.. باوەڕم نەدەکرد ئەم کچە مەدەنیە بەم باڵاپۆشیەوە لەبەردەممدا دادەنیشێت، بەسەرسامیەوە ووت:

– تۆ تۆ ؟

– بەڵێ ، پرسیاری تۆم لە هاوەڵەکانت کرد، پێیان ووتم کە تۆ نەخۆشی، بۆیە ناوی خەستەخانە و ژمارەی ژوورەکەتم لەوان وەرگرت ، هەتا بتوانم سەردانت بکەم چونکە لە سەردان کردنی نەخۆشدا خێر و پاداشتی زۆر هەیە.

– نازانم چۆن سوپاست بکەم لەسەر ئەم هەستە پاکە .. دوای لێبوردن دەکەم لەسەر ئەوەی کە لەلایەن منەوە ڕویدا.

– هیچ نی یە، گرنگ ئەوەیە تۆ بەسەلامەتی دەرچیت .. چونکە تاقیکردنەوەکان نزیك بۆتەوە ..

پاشان لە جاناتاکەیدا کۆمەڵێك پەڕەی دەرهێنا و ووتی:

ئەمە ئەو وانانەیە کە لەکیست چووە، لەکۆتایی هەر وانەیەکدا پوختەکەی

دەبینی..ئینشائەڵڵا هەفتەی داهاتوو دێمەوە بۆ سەردانت و وانە تازەکانت بۆ دێنم.

ئیتر خۆم پێنەگیرا دەستم کرد بە گریان .. ئەوەم بیرهاتەوە کە لە بەردەرگای زانکۆ و ناو کافیتریا چۆن بە توندی بەرپەرچم دەدایەوە .. لەگەڵ ئەوەشدا ئەو بەم نەرمی و جوانی یە و بەوپەڕی خۆشەویستیەوە مامەڵەم لەگەڵ دەکات، لە بەرامبەر ئەوەدا هاوڕێکانیشم بیرکەوتەوە، کە ئەو پەڕی چروکی و ڕەزیلیان نواند بەرامبەرم بە سەردانێك یان بە هەواڵ پرسینێك لە ڕێگای تەلەفونەوە، ئەوکاتە هەموو بیرو بۆچونەکانم لەسەر سەربەستی و ئازادی و هاوچەرخی تێکشکا و ڕوخا.

تێگەیشتم کە سەربەستی بریتی نی یە لە پشتکردنە بەها باڵاکان.. پشتکردنە عادەت و ڕەوشتە جوانەکان.. هاوچەرخی بریتی نی یە لە وەستان لە دژی دین و شوێن کەوتنی کۆمەڵێك بیرو بۆچون کە لە ئێمەوە دوورە.

ئێستا تێگەیشتم کە سەربەستی بریتی‌یە لە جڵەو کردنی نەفس.. ملکەچ نەبوون بۆ حەزوو خواستەکان وخۆ بەدەستەوەدان بۆ ئارەزووەکانی .. سەربەستی بریتی یە لە هەستکردن بە کەسانی دەوروپشتت.. یارمەتی دانیان و کەمکردنەوەی ئازارو ناخۆشیەکانیان .. تێگەیشتم کە ئیسلام سەربەستی داوە بە ژن.. ئەو مافەی پێداوە کە بتوانێ ژیانێکی شەرەفمەندانە بەرێتە سەر.

بەهاوڕێکەم وت: ئێستا دان بەوەدا دەنێم کە من دۆڕام..بۆیە بڕیارم دا لەم ساتە بەدواوە ژیانی خۆم بگۆڕم بەپێی شەرعی خوا.. تا ببمە کچێکی باشی وەك تۆ.

لەکاتێکدا دەموچاوی بە زەردەخەنە دەدرەوشایەوە وتی:

ئای خوشکم لەپەیوەندیماندا سەرکەوتوو و تێکشکاو نییە..گرنگ ئەوەیە

هەموو بگەینە کەناری ئارامیو سەرکەوتنی ڕاستەقینەو بەختەوەری هەتاهەتایی.وتم:

بەڵێ ئەوە گرنگە ..

## فرمێسکی باڵا پۆشێك

بەم جۆرە بۆمان دوا:

کچێکی لاو بووم، تازە پێگەیشتوو، تامەزۆری ژیان بووم ، ڕقم لە مردن بوو ...!! هەرکات لەناو دەستە خوشکەکانمدا باسی ڕووداوێکی خەمناك یان مردنێکی کوتوپڕ یان نەخۆشیەکی بەردەوام بکرایە هەڵدەستامە سەرپێ و ئەو ناوەم بەجێ دەهێشت! زۆر گرنگیم بە هەواڵی مۆدێلات دەدا و چاودێریم دەکرد، دەمویست هیچم لە دەست دەرنەچێت و ئاگاداری بابەتە نوێیەکان بم، ئەمە بە جۆرێك بوو کە عەبا ڕەشەکەم بەپێی مۆدێل بوو، مۆدە ئەویشی وەك خۆی نەهێشتبۆوە دەبوو لە لەبەر کردندا هونەر بەکاربهێنم، زۆر جار دەمخستە سەر شانم نەك سەرم هەتا جوانی لەش و لارم دەربخەم..

هەرچی پەچەکەم بوو، بە جۆرێك دام دەنا کە لەگەڵ مۆدە و باودا بگونجێ، ئەوەشم دەکردە بیانوو کە ناتوانم شت بە جوانی ببینم، چاوەکانم جوان دەرشت.

سادەیی و بێ ئاگاییم لەوەدا بوو لەکاتی هاتۆچوی سەر ڕێگا وباندا بەردەوام سەرنجی ئەو چاوانەم دەدا کە بە لامدا تێپەڕ دەبوون، هەرکات هەستم بکردایە کە ڕێبواران و سواڵکەرانی سەرە ڕێ بەسەرسامیەوە سەیرم دەکەن زۆر دڵخۆش دەبووم.

لە یەکێك لە گەشتەکانم بۆ یەکێك لە وڵاتانی ڕۆژئاوا، بەوەندەوە نەوەستام کە جلەکانم بە پێ ی مۆدیل بڕازێنمەوە بەڵکو بەرگە باڵاپۆشەکەم لەسەر کورسی ئەو فڕۆکەیەی کە سواری بوو بوم بەجێ هێشت!

لەو وڵاتە نیگام بەر ژنێك کەوت کە هیچ شوێنێکی بە دیارەوە نەبوو، باڵاپۆشێکی درێژ و فراوانی لەبەر کردبوو.سەرپۆشێکی جوانی لەسەر

کردبوو، لێ ی نزیك بومەوە بە زمانێکی بێگانەی پاراو قسەی دەکرد !!

سەرسام بووم واهات بە دەروندا کە ئەم ژنە عەرەبە و لەوێ نیشتەجێ بووە، فێری زمانی ئەوێ بووە، بۆیە بەو پەڕی لە خۆڕازی بونەوە لێم پرسی تۆ عەرەبیت؟

نەخێر من کەنەدیم، ئەوە ساڵ و نیوێکە موسڵمانم، وەك دەمبینی لەو کاتەوە ئەم پۆشاکە لەبەردەکەم، زۆر شانازی دەکەم بەم ئاینە نوێ یەوە.

لەو کاتەدا وەك ئەوەی تام لێهاتبێت دەستم خستە سەر سەرم، بالاپۆشەکەم لە کوێیە ..؟ گەڕام بە دوایدا! بەڵام نەمدۆزیەوە، بیرم کەوتەوە کە لەسەر کورسی فڕۆکەکە بەجێم هێشت.

لەگەڵ دەرونی خۆمدا کۆمەڵێك ڕازو نیازم کرد، ئەی خودایە بێگانەیەك پێشتر تۆی نەناسیوە، ئەوە بۆ ساڵ ونیوێك دەچێت گەڕاوەتەوە بۆ لات و بۆتە بالاپۆش! کەچی منی موسڵمان، لەکاتێکدا باوك و باپیرەم موسڵمانن .. دایك و خوشکم موسڵمانن .. کەسوکارم هەموی موسڵمانن !

لەسەر بەندایەتی و گوێڕایەڵی تۆ گەورە بووم، لە فەزایەکدا پێگەیشتووم کە هەموو باوەڕیان بە تۆیە، کەواتە چۆن بەم ئاسانیە واز لە بالاپۆش بهێنم و ئەم ژنەش ئاوا لەبەری بکات!

ئەی کچی ئیسلام:

بالاپۆش جوانترین و گەورەترین هاوکارە بۆ پارێزگاری کردن لەسەر چاکی و جوانی ژن، بۆی دەبێتە قەڵغان لە چاوی خراپ و سەرنجی تاوانکاری.

ئەوانەی تاڵی خۆدەخستنیان چەشتووە ئەو ڕاستیە باش دەزانن، بە تایبەت ئەوانەی بە ئاگری تاوانی تێکەڵاوی ناشەرعی و سێکسی سوتاون.

دوژمنانی ئەم ئاینە دەرکیان بەم ڕاستیە کردووە و دانیان بەو ڕاستیەدا ناوە.

دوای بەسەربردنی چەند هەفتەیەك لە پایتەختی یەكێك لە وولاتە عەربیەکان ڕۆژنامەی ئەمریکی (هیلسیان ستاسنبری) كە گەڕایەوە وڵاتی خۆی بەم جۆرە باسی لە گەشتەکەی کردبوو:

"کۆمەڵگای عەرەبی كۆمەلگایەکی سەلامەتە ئەمەش بەهۆی دەست گرتنیان بە نەریتی خۆیانەوە باشترە كە ئەمەش لە هەرکارێکی تر باشترە، وەك هێشتنەوەی کچان و لاوان لە سنورێکی دیاریکراودا.

ئەم كۆمەڵگایە جیاوازە لە کۆمەڵگای ئەوروپی و ئەمریکی چونکە هەڵگری ڕەوشتێکی جوانن كە لە لە پێشینانەوە بۆیان ماوەتەوە كە سنورێك بۆ ژنان دادەنێت.

ڕێز گرتنی دایك و باوك دەبێتە پێویستی لە سەریان، لەوەش زیاتریان لێ داوا دەکات ئەویش نەکردنی ئەو بەرەڵایەیە كە لە ئەورووپای ئەمڕۆدا هەیە كە کۆمەڵگا وخێزانی ئەمریکی و ئەورووپی بەرەو هەڵوەشان دەبات."

گۆڤارەکە داوا دەکات:

" بواری تێکەڵ بوون مەدەن.. سەربەستی کچان سنورداربکەن، بگەڕێنەوە بۆ سەردەمی باڵاپۆشی، ئەمە باشترە بۆتان لەو بەرەڵایی و شێتیەی ئەورووپا و ئەمریکا" (لەنامەی ژن و فێڵی دوژمنان)

ئەی خوشکم:

ئەمە گوتاری ژنێکی ئەمریکیە، داوای باڵاپۆشی دەکات ئەمەش پاش ئەوەی بە کردووە هەستی بەوە کردووە كە هەڵوەشانی خێزان و نەمانی ڕەوشت دەبێتە هەڕەشە بۆ سەر کۆمەڵگا .

ڕۆژنامەنوسێکی ئەمریکی ئامۆژگاریمان دەکات كە دەست بە ڕەوشتی

ڕەسەنی ئیسلامی و نەریتی جوانی خۆمانەوە بگرین.

ڕۆژنامەنوسێکی ئەمریکی ئاگادارمان دەکاتەوە.. لەبێ ئاگایی تێکەڵاوبونی نێر ومێ وبەرەڵایی، کە دەبێتە هۆی جڵەو کردن و بردنی کۆمەڵگا بەرەو هەڵدێر.. وەك چۆن ئەمرۆ کاریگەریەکەی لەسەر کۆمەڵگای ئەورویی و ئەمریکی دیارە.

مژدە ئەی کچی ئیسلام .. چاوت ڕۆشن بە بەرگە بالاپۆشەکەت ، بزانە کە داهاتوو بۆ ئەم دینەیە .. سەرکەوتوویی و پاشەڕۆژ بۆ کەسانی لەخوا ترسە هەرچەندە بێباوەڕان پێیان ناخۆش بێت.

{يُرِيدُونَ لِيُطْفِؤُوا نُورَ اللَّهِ بِأَفْوَاهِهِمْ وَاللَّهُ مُتِمُّ نُورِهِ وَلَوْ كَرِهَ الْكَافِرُونَ} الصف٨

## نیعمەتەکان و تاوان

راوی بەم جۆرە دوا:

لە یەکێك لە کەناڵەکانی تەلەفزیۆنەوە گوێم لە وانەیەکی مامۆستا عەمر خالید بوو کە ووتە بە پێزەکانی سەرنجی ڕاکێشام کە تیایدا باسی تەوبە و تەوبەکارانی دەکرد .. ئەوە بوو لە کۆتایی وانەکەیدا چووە سەر بابەتێکی دیاریکراو کە ڕایچڵەکاندم و بووە هۆی جوڵانی هەست و سۆزم کە تا ماوەیەکی زۆر هەڵوێستەم لەسەر کرد ..

مامۆستا باسی لە ئەنجامدانی تەجروبەیەك کرد و دڵنیایی ئەوەیدا کە کە بەرهەمەکەی جۆشاندنی تەوبە و گەرانەوەیە بۆ لای خوا ..

منیش بڕیارمدا ئەو هەنگاوە بگرمە بەر ، چوومە ژوورەکەی خۆم و دوو پەڕەو پێنوسێکم هێنا ، لەسەر پەرەی یەکەم نوسیم لیستێك بە ناوی ئەو نیعمەتانەی کە خوایێ داوم ..! وە لەسەر پەڕەی دووەم نوسیم : لیستی تاوان و هەڵە و گوناهەکانم ..!

دەستم بە نوسینی ئەو بەخششانە کرد کە خوا ڕشتویەتی بەسەرمدا، هەموو ئەوانەی کە لە چواردەورەمن و پەیوەندیان هەیە بە ژیانمەوە .. بەردەوام بووم دەمنوسی و دەمنوسی لەکاتێکدا بەخششەکانی خوا بە بەرچاومەوە تێپەڕدەبوون، هەرچەندە بەخششێکم بنوسیایە دانەیەکی تر دەهاتە بەرچاوم ، زۆر لەو نیعمەتانە پەیوەندیان بەیەکەوە هەبوو یان لەسەر یەك بنیات نرابوون ، لەو نیعمەتانە :

بەخششی عەقڵ و ژیری، توانای شی کردنەوە و دەرهێنانی ئەنجامەکان، توانای خستنە ڕوی بیروبۆچونەکان، توانای قسەکردن و ڕونکردنەوە بە جوانی و لە زۆر کاتدا بەهۆی نیعمەتی گەورەی زمان.. نیعمەتی چاو، بەبێ پێویستی

بەکارهێنانی چاویلکە، .. ئەویش نیعمەتێکی ترە... نیعمەتی خوێندنەوەو نوسین و.. هتد، بەم جۆرە پەڕەی یەکەم تەواو بو بەڵام مەرجی زانین و دەرخستنی نیعمەتەکانی خوا تەواو نەبوو، بۆیە پەڕەیەکی ترم هێنا و بەردەوام بوم لەسەر نوسینی نیعمەتەکان ..

نیعمەتی بون و تەندروستی و سەلامەتی لەش ولار و تەواوی ئەندامەکان .. نیعمەتی زانست و توانای فێربون ، نیعمەتی بۆن و بیستن و جوڵە و ... هتد

دوای تەواو بونی پەڕەی دووەم بێ توانا و بێ دەسەڵات وەستام لە بەرامبەر نیعمەتەکانی خوادا.. خۆم بینی لە کەسێکی نیمچە نقوم بوو دەچم لەناو دەریایەکی گەورەدا.. سەرەنجام بەو هەندەی نیعمەکانی خوام نوسی وەستام و ئەو ئایەتەم دەوتەوە {وَإِن تَعُدُّواْ نِعْمَةَ اللّهِ لاَ تُحْصُوهَا إِنَّ اللّهَ لَغَفُورٌ رَّحِيمٌ}النحل١٨

چومە سەر لیستی دووەم لەکاتێکدا دڵم دەلەرزی و پڕ بوو لە هەستی شەرم کردن لە بەرامبەر پەروەردگار .. بەم جۆرە بەردەوام بوم لە نوسینی ئەوەی دەمزانی لە تاوان و گوناە و لەخوا یاخی بون کە کردبوم و هێشتا هەر تۆزاوی بوم بە زۆرێك لەوانە..

هەروەها ئەو تەمەڵی و کەموکورتی وخەمساردیانەم نوسی کە لە فەرزەکاندا هەمبوو.

لەوانەی کە نوسیم : ئەو تاوانە زۆرانەی کە بەزمان کردبوم لە غەیبەت و گاڵتە کردن بە خەڵك و درۆ، تاوان کردن بە چاو لە سەیر کردنی بۆ ئەو شتانەی کە خوا پێی ناخۆشە، بەسەر بردنی چەندین کاتژێر بەبەتاڵی کە جگە لە زیان هیچ سودێکی نەبوو .. کردنی گوناە بە گوێکان لە ڕێی بیستنی ئەو

شتانەی کە خوا پێی ناخۆشە وەك گوێ گرتن لە گۆرانی .. هەروەها ئەرك و مافی دایك و باوك و ..... هتد بەمجۆرە بەردەوام بوم لە نوسین، ئەمەیان بەخێرایی زیادی دەکرد، کاتێك ئەم هەموو هەڵخلیسکان و لادان و کارە ناشەرعیانەم بینی ترسم لێنیشت ، پاشان پەڕەیەکی ترم هێنا تا گەشتی گەڕانەکەم تەواو بکەم .. بەم جۆرە لە نێوان دوو لیستدا بوم لیستی یەکەم نیعمەتێکی زۆر و ڕژاو کە ژیانمی لەسەر وەستاوە .. بەڵێ هەر لە تەوقی سەرم هەتا قولە پێم نوقم بووە لەو بەخششە خواییەدا و بە چوار دەورمدا ڕژاوە ، هەر لە ساتی لە دایك بونەوەم هەتا ئەمڕۆ، هەمو ئەم دیاریانەم وەرگرتوە بەبێ ئەوەی داوام کردبێت.. خوا خۆی دەزانێ کە چەندە پێویست و بەسودن بۆ من ...

بەلاَم لیستی دووەم : لیستێکە بەهۆیەوە لە ئاست پەروەردگاردا لەشەرمەزاریدا دەلەرزم ..

لیستێکی ڕەشی قەترانی یە.. هەموی تاوان و گوناح و هەڵخلیسکان و کەموکورتی یە لەبەرامبەر خوای پەروەدگار ... !

هەستم بەو دڵۆپە فرمێسکانە نەدەکرد کە بەسەر ڕومەتمدا دەهاتنە خوار، کە بۆ جارێکی تر سەیرم دەکردن و جارێك لەم ورد دەبومەوە جارێك لەویتر.

ئەو فەرمودە قودسیە پیرۆزەم هاتەوە یاد کە خوای گەورە دەفەرموێت ( اني و الجن والانس في نبأ عظيم ،أخلق ويعبد غيري وأرزق ويشكر غيري) ضعيف رواه الحكيم والبيهقي.

ئەو کاتە هەستم بە شەپۆلێکی بەهێزی شەرم کرد کە نوقمی ناوخۆی دەکردم، بەڵکو هەستم بە هەڵچونێکی خۆشەویستی دەکرد کە بۆ لای خوای گەورەی دەبردم .. چۆن دڵم خۆشی نەوێت لەکاتێکدا ئەو بەو جۆرە جوان و

سەرنج ڕاکێشە مامەڵەم لەگەڵ دەکات، منیش بەم جۆرە نامۆ و ناشیرینە مامەڵەی لەگەڵ دەکەم . !

کەوتمە سەرزەنشت کردنی نەفسم، خورپەیەك بە دەروندا هات.. وای لێکردم دەست بە گریان بکەم، ئەوەم بە بیردا هات چۆن مامەڵە لەگەڵ منداڵەکانم دەکەم.. چۆن فەرمانیان پێ دەکەم کە گوێڕایەڵیم بکەن و لە فەرمانم دەرنەچن، تەحەمولی سەرپێچی کردنیان ناکەم و بەمجۆرە خراپترین وتوندترین سزایان دەدەم کە زۆر جاریش گونجاو نی یە بۆیان !

لە دەرونی خۆمدا وتم: چۆن دەبوو ئەگەر خوای گەورە بەو جۆرەی کە من مامەڵە لەگەڵ مناڵەکانم دەکەم مامەڵەی لەگەڵ بکردمایە ...! بێگومان تیادەچوم ..

بە ڕاستی ئەمخەڵوەتەی کە کێشام لەگەڵ خوای پەروەردگار تەنها تەنها کاتژێرێك بوو، بەڵام باشترین ساتەکانی تەمەنم بوو، بە جۆرێك هاتمە دەر دڵم هەستی بە سۆز و ئارامی دەکرد، ترس و هیوا و شەرم و خۆشەویستی .. خوایە دڵم پڕ بکە لە خۆشەویستی خۆت .. خودایە ... خودایە .. ئامین

## پزیشکێکی ژنی ئەمریکی

**بەم جۆرە بەسەرهاتی خۆی باس دەکات:**

بۆ هەشت ساڵ دەچێت لە یەکێك لە خەستەخانە ئەمریکیەکان کاردەکەم، پسپۆڕم لە بواری ژنان و منداڵبووندا،ساڵی ڕابردوو ژنێکی عەرەبی موسڵمان هاتە لامان هەتا لە خەستەخانە منداڵی ببێت، ژان گرتبووی بەدەم ئازارەوە دەینالاند بەڵام نەمدی بگری و هیچ فرمێسکێکم بە چاویەوە نەدی ، ماوەی کارکردنم لە خەستەخانە بەرەو کۆتایی دەچوو، هەواڵم پێدا کە من دەچمەوە ماڵ. دکتۆرێکی تر جێگەی من دەگرێتەوە بۆ تەواو کردنی ئەرکی منداڵ بونەکەی، بە بیستنی ئەم هەواڵە دەستی کردە گریان.. هاواری دەکرد و ئەوەی دووبارە دەکردەوە: نا .. نا پیاوم ناوێ .

سەرسام بوم لەو مەسەلەیە، پرسیارم لە مێردەکەی کرد کە بۆچی؟ هەواڵی پێدام کە نایهەوێت پیاو بێتە لای و بیبینێ، چونکە بە درێژایی ژیانی کەس دەموچاوی نەدیوە.. جگە لە باوك و برا و خوشك و مامەکانی واتە ئەوانەی کە پێ ی مەحرەمن.

پێکەنیم و بەسەرسوڕمانێکی زۆرەوە وەڵامم دایەوە: باوەڕناکەم پیاوێك مابێت لە ئەمریکا دەموچاوی منی نەدیبێت!

لەبەر ئەوە وەڵامی داواکەیم دایەوە و بڕیارمدا کە لەبەر ئەو دانیشم هەتا تەواو دەبێت، ئەوانیش سوپاسیان کردم و دوو کاتژێر مامەوە هەتا منداڵەکە لەدایك بوو .

دوای لەدایك بونی منداڵەکە و بۆ ڕۆژی دوابی بە مەبەستی دڵنیابوون لە باری تەندروستی سەردانم کرد ، پاشان ئەوەم بۆ باسکرد کە زۆر لە ژنان توشی نەخۆشی و هەوکردنی ناو لەشیان دەبن.. بەهۆی پشت گوێ خستنی ماوەی

دوای منالّ بون (نفاس)و پارێزنەكردن و گویّ نەدان بە خۆیان بەهۆی تێكەلّ بوون لەگەلّ پیاوەكەی ، پاشان ئەو بۆی باسكردم كە لە ئیسلامدا و لەو ماوەیەدا هەتا ژن پاك نەبێتەوە تێكەلّ بوون لەگەلّ پیاودا دروست نیەیە و ئەم ئایەتی هێنایەوە كە خوای گەورە دەفەرموێت (وَيَسْأَلُونَكَ عَنِ الْمَحِيضِ قُلْ هُوَ أَذًى فَاعْتَزِلُواْ النِّسَاء فِي الْمَحِيضِ وَلاَ تَقْرَبُوهُنَّ حَتَّىَ يَطْهُرْنَ فَإِذَا تَطَهَّرْنَ فَأْتُوهُنَّ مِنْ حَيْثُ أَمَرَكُمُ اللّهُ إِنَّ اللّهَ يُحِبُّ التَّوَّابِينَ وَيُحِبُّ الْمُتَطَهِّرِينَ) البقرة٢٢٢

هەروەها پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) فەرمویەتی (هەر كەس چوە لای ژنەكەی لە كاتی حەیز (سوڕی مانگانە) دا، یان لە پاشەوە چوە لای ئەوە بیّ باوەڕە بەوەی كە هاتۆتە خوار بۆ محمد) تورمزی ڕیوایەتی كردوە.

زۆر سەرسام بوم لەوەی كە بۆی باسكردم، لە كاتێكدا كە سەرقاڵی وتوێژ بوم لەگەڵیدا دكتۆرێكی تایبەت بە منالّ هاتە لای تادڵنیا بێت لە تەندروستی منالّەكە، بە ژنەكەی وت: باشتر وایە كە منالّەكە بخەیتە سەر لای ڕاست ئەمەش بۆ ئەوەی لێدانی دڵی ڕێك بێت..

باوكەكە لەو كاتەدا وتی: ئێمە هەر لەسەر لای ڕاست دایدەنێین بەپێی سونەتی پێغەمبەرمان محمد (صلى الله عليه وسلم).

بەمەش زۆر سەرسام بوم ..

ئێمە تەمەنێكمان بەسەر برد هەتا گەیشتینە ئەم زانستە.. بەڵام ئەوان لە دینەكەیانەوە زیاتر لە هەزار و چوار سەد ساڵە ئەوە دەزانن، بۆیە بڕیارمدا خۆم بەم ئاینە ئاشنا بكەم و ئەم دینە بناسم، بۆ ئەو مەبەستە مۆڵەتی مانگێكم وەرگرت.

چووم بۆ سەردانی ناوەندێكی گەورەی ئیسلامی لە شارێكی تر ، كاتێكی

زۆرم لە پرسیار و لێکۆڵینەوە و بینینی موسڵمانان بەسەر برد هەر لە عەرەب و ئەمریکیەکان، پاشان ئەوێم بەجێ هێشت و لەگەڵ خۆمدا هەندێ لەو بڵاوکراوانەم هەڵگرت کە باس لە ئیسلام دەکەن ، دەستم کرد بە خوێندنەوەیان.. پەیوەندی بەردەوامم هەبو بە هەندێك لەو کەسانەی کە لە ناو ناوەندەکە کاریان دەکرد.

سوپاس بۆ خوا دوای چەند مانگێك موسڵمان بونی خۆم ئاشکرا کرد.. دوای ئەوەی بۆم دەرکەوت کە ئەم دینە هەق و ڕاستە و جگە لەویش بەتاڵە.

## پرۆفیسۆر ولیام چۆن موسڵمان بوو

"تُسَبِّحُ لَهُ السَّمَاوَاتُ السَّبْعُ وَالأَرْضُ وَمَن فِيهِنَّ وَإِن مِّن شَيْءٍ إِلاَّ يُسَبِّحُ بِحَمْدَهِ وَلَـكِن لاَّ تَفْقَهُونَ تَسْبِيحَهُمْ إِنَّهُ كَانَ حَلِيماً غَفُوراً "الإسراء٤٤

زانای ئەمریكی ولیام براون چۆن موسڵمان بوو؟ لەبەر چی موسڵمان بوو؟ هەندێ ڕووەك شەپۆلی سەرو دەنگیان دەردەكرد كە دوایی دەركەوت شەپۆلەكان مانای "الله" دەبەخشن ..

یەكێك بوو لەو پەرجوانەی كە زانایانی ئەمریكی سەرسام كرد، توێژینەوەكە لە گۆڤاری زانستی Journal of Plant Molecular Biology كە گۆڤارێكی بەناوبانگە بلاوكرایەوە، كۆمەڵێك لە زانا ئەمریكیەكان تێبینی ئەوەیان كرد كە هەندێ لە ڕووەكە ئیستیوائیەكان شەپۆلی سەرو دەنگ دەردەكەن، كە لە كۆتاییدا توانرا ئەو شەپۆلە دەنگیە دەستنیشان بكرێت و بە نوێترین ئامێری زانستی تۆماربكرێت .

دوای ئەوەی زانایان نزیكەی سێ ساڵیان لە   لە چاودێری كردن و لێكۆڵینەوەی ئەم دیاردە سەیرەدا بەسەربرد، ئەنجام توانیان ئەو شەپۆلە دەنگیانە شیكار بكەن بۆ هێمای كارۆ تیشكی بەهۆی ئامێری نیشان كردنی ئەلەكترۆنی oscilloscope، كە سەرەنجام زانایان توانیان ئەو شەپۆلانە ببینن كە لە چركەیەكدا ١٠٠ جار دووبارە دەبنەوە !

بە مەبەستی لێكۆڵینەوە لەو بوارەدا پرۆفیسۆر ولیام براون سەرپەرشتیاری تیمێكی تایبەتی زانایانی كرد و باسی لەوە كرد كە دوای دەستكەوتنی ئەو ئەنجامانە، هیچ لێكدانەوەیەكی زانستیمان نەبوو بۆیە ئەو خستمانە بەردەم كۆمەڵێك لە زانكۆ و ناوەندە تایبەتمەندەكان لە وڵاتە یەكگرتوەكانی ئەمریكا،

بەڵام ئەوانیش دەستەوسان بون لـە لێکدانەوەی ئەو دیاردەیە و توشی سەرسامی بون ....

دوایین جار ئەم تاقیکردنەوەیە لـە بەردەم تیمێك زانای بەریتانیدا ئەنجامدرا.. لـە نێوانیاندا زانایەکی بەریتانی ڕەگەز هیندی هەبوو کە موسڵمان بوو، دوای بەسەر بردنی پێنج ڕۆژ لـەو شیکاریە کە ببوە جێگەی سەرنجی تیمە بەریتانیەکە تا سەرەنجام زانا بەریتانیە موسڵمانەکە ووتی: لـە ١٤٠٠ لـەمەوبەرەوە ئێمەی موسڵمان لـێکدانەوەمان بۆ ئەم دیاردەیە هەیە ، زاناکان بەمە سەرسام بون و داوایان لـێکرد کە بۆیان ڕون بکاتەوە.. ئەویش ئەم ئایەتەی بەسەردا خوێندنەوە:

وَإِن مِّن شَيْءٍ إِلاَّ يُسَبِّحُ بِحَمْدَهِ وَلَـكِن لاَّ تَفْقَهُونَ تَسْبِيحَهُمْ إِنَّهُ كَانَ حَلِيماً غَفُوراً }الإسراء٤٤

ئەم لـەرە کارۆ تیشکیانەی سەر شاشەی ئامێرەکە ناوی خوایە ! بێدەنگی و سەرسامی ئەو هۆڵـەی گرتەوە کە زانا موسڵـمانەکە قسەی تیا دەکرد.

سبحان الله بەو جۆرەی کە خوای گەورە خۆی هەواڵی پێداوین هەموو شتێك لـەم بونەوەرەدا یادی خۆی دەکات، ئەوەش پەڕجویەکی ترە لـە پەڕجووەکانی ئەم دینە پاکوخاوێنی بۆ تۆیە خوایە.

ئەمە ویستی خوایە و گەورەیی قورئان دەردەخات کە لـەلایەن زاتی خۆیەوە بە خەڵات نێردراوە بۆ پێغەمبەرێکی نەخوێندەوار بەر لـە ١٤٠٠ساڵ.

لـێرەدا ولیام براون سەرۆکی تیمی تایبەت بەو توێژینەوەیە کەوتە گفتوگۆ لـەگەڵ زانا موسڵـمانەکە، زاناکەش کەوتە باسکردنی ئیسلام و پاشان قورئانێکی بە دیاری پێدا کە وەرگێڕدرابووە سەر ئینگلیزی.

دوای چەند ڕۆژێك پرۆفیسۆر ولیام براون لـە زانکۆی کارنیج (میلون)

کۆڕێکی گرت، لەناو قسەکانیدا وتی " لێکۆڵینەوە لەم دیاردەیە نزیکەی سی ساڵی خایاند کە من خۆم لە تەمەنمدا لە نمونەی ئەو دیاردەیەم بەرچاو نەکەوتووە و هیچ کام لەو زانایانەی کە لە تیمی توێژینەوەکەدا بون نەیانتوانی ئەم دیاردەیە لێك بدەنەوە ، وە لەناو سروشتدا دیاردەیەك نەبوو کە بۆمان لێك بداتەوە، هەتا ئەوەبوو تاکە لێکدانەوە بۆ ئەم دیاردەیە لە قورئاندا دۆزرایەوە .

بۆیە ناتوانم لە بەرامبەر ئەمەدا هیچ بلێم جگە لە "اشهد ان لا الە الا الله و اشهد ان محمدا رسول الله"

بەم جۆرە ولیام براون لە نێوان سەرسوڕمانی ئامادەبواندا موسڵمان بونی خۆی ڕاگەیاند.

*لە گۆڤارێکی زانستی ئەمریکی وەرگیراوە*

## موسڵمان بونی کچێکی ئینگلیزی

لەوێ کچێك دەژیا، هەڵگری ڕەگەزنامەی بەریتانی بوو، ئەم کچە نیشتەجێی شاری لەندەن بوو، هێشتا لە تەمەنی لاوێتیدا بو کە باوکی پێی وت: ئیتر لەمەودوا دەتوانی پشت بە خۆت ببەستی ..

(سەیربکەن براکانم ئەمەیە هەڵوەشان و لێکترازان ، ئەمەیە نزمی و بێ ڕێزی کە لەم شارەدا بەرامبەر مرۆڤ پەیڕەو دەکرێت .. بە چەشنێکە کە دەست بەرداری خۆشەویسترین کەسی خۆی دەبێت )

بەم جۆرە ئەم کچە کە نائومێدی لەناوچەوانیدا دەخوێنرایەوە سەری خۆی هەڵگرت، بەڵام بۆ کوێ و بۆ لای کێ؟ چی بکات و ڕوو لە کوێ بکات ؟ وەك خۆی باسی کرد ڕۆیشت بۆ ئەوەی بگەڕێت و کەسێك بدۆزێتەوە تا بیکاتە شەریکی ژیانی ئەگەر بۆ چەند رۆژێکیش بووە، دەگەڕا بە دوای لاوێکدا تابیکاتە هاوڕێ، گرنگ نەبوو چ لاوێك بێت، مەبەست دەست کەوتنی خۆشەویستی و ئارەزوو نەبوو وەك خۆی باسی کرد بەڵکو بۆ دەست کەوتنی شوێنێکی نیشتەجێ بوون بوو.

کەسێکی دەویست بۆی ببێتە پشتیوان و کۆڵەکەیەك تا پشتی پێ ببەستێت، پێویستی بە کەسێك بوو کە دڵی پڕ بێت لە بەزەیی و خاوەن سنگێکی فراوان بێت، کەسێك گوێ بۆ ئاوات و ئازارەکانی بگرێت،بەڵام دەستکەوتنی کەسێکی وەها و لەو وڵاتەدا لە ئەفسانە دەچوو.

چەند ساڵێك تێپەڕ بوو، لەو ماوەیەدا لەم هاوڕێیەوە دەچوو بۆ هاوڕێیەکی تر ، بەم جۆرە چەند هاوڕێیەکی گۆڕی، تا لە ئەنجامی ئەو پەیوەندیانەوە بووە خاوەنی دووکچ و کوڕێك. بەڵام دونیای لا تەنگ و تەسك بوو، زۆر لە ژیان بێزار بوو، هیچ ئارەزوو و خۆشیەکی لێ نەئەدی.

خەمەكانی دەروونی داگیركردبوو وای لێكردبوو كە بیر لە خۆكوشتن بكاتەوە، لەبەر ئەوەی كەسێكی بێلانە و جێگا بوو، وەك پێویست خواردنیشی نەبوو.. هەرچەندە حكومەت بۆ كەسانی وەك ئەو موچەی مانگانەی دابین كردبوو بەڵام بەشی نەدەكرد ..

بۆ دواجار ئەم دایكە بەبێ هیوایی ڕوی كردە كەنیسە بەڵكو چارەیەكی دەست بكەوێت.. كاتێك چوو و چیرۆكی خۆی بۆ باسكردن.. چارەسەر لای قەشەكان تەنها ئەوە بو كە دوعا و نوێژی بۆ بكەن ..

دوای بێ هیوا بونی بڕیاری خۆكوشتنی دا، هەندێك مادەی زەرنیخی ژەهراوی هێنا و لە كۆڵانێكی تەسكدا كە بە كەمی نەبێت كەس پیایدا تێپەڕ نەدەبوو، دەیوست بیخواتەوە..

بەڵام ویستی خوای گەورە جۆرێكی ترە لەم كاتەدا گەنجێك تێپەڕ بوو، هەستی بەوە كرد كە ئەم ژنە دەیهەوێت خۆی بكوژێت لەبەر ئەوە بەجێی نەهێشت و بڕیاریدا كە ڕزگاری بكات و هەوڵی لەگەڵدا بدات كە واز لەم كارە بهێنێ .

ئەم كوڕە گەنجێكی موسڵمانی بە ڕەگەز عەرەب بوو، كچەكە بە قسەی گەنجەكەی كرد و وازی لە خۆكوشتن هێنا و شوشە زەرنیخەكەی فڕێدا.

دوای ئەوە گەنجەكە ئەم دایكەی بانگهێشت كرد بۆ شوقەكەی خۆی بۆ خوانی ئێوارە، چونكە ئەمە یەكەم جارنیی بانگهێشت دەكرێت و لەبەر ئەوەی گورگە چاو برسیەكان وەك نێچیر چەند جار ئەم دایكەیان ڕاوكردووە و دوای تێركردنی حەزەكانی خۆیان پشتیان تێكردووە بۆیە بە گومانەوە سەیری ئەمەشی كرد و زۆر بە توندی بەرپەرچی دایەوە و پێی ووت: تۆ چیت لە من دەوێت؟

ئەتهەویَ ئەوە بکەیت کە گەنجانی تر دەیان کرد! بەڵام گەنجەکە بە هێمنی وەڵامی دایەوە و پیێی وت: نەخێر خانمەکەم ئاینەکەم ڕێگەم پیێ نادات کە تاوان ئەنجام بدەم و کاری ناشەرعی و خراپەکاری بەرامبەر کەسانیتر بکەم.

ئەم گەنجە چەند جار دووبارەی کردەوە و سور بو لەسەر داواکەی، بە تایبەت دوای ئەوەی لە چیرۆکی ئەم دایکە تێگەیشت.

دوای ئەوەی لە هەڵوێستی ئەم لاوە دڵنیا بوو، ڕازی بوو بەڵام بەو مەرجەی منداڵەکانیش بەرێت، پاشان پێکەوە چون بۆ شوقەی لاوەکە، دوای نان خواردن، داوای لێکرد بە شێوەیەکی تێر و تەسەل باسی ژیانی خۆی بۆ بکات.. ئەویش لە کاتێکدا دڵی پڕ بوو و فرمێسك لە چاوەکانی دەهاتە خوار بە شەرمەوە باسی لەوە کرد کە ئەو تەنها کچێك نی یە کە بەم جۆرە نارەحەتیانەدا تێپەڕ ببێت.. بەڵام ئەم لەوە زیاتر نەیتوانی لەسەر ئەو بارە بەردەوام بێت بە پێچەوانەی زۆرێك لە کچان..

بە کورتی باسی لەوە کرد کە چۆن هەستی بە نارەحەتی و سزای ویژدانی کردووە، باسیشی لەوە کرد کە ئەو باوەڕی بەو سەربەستیە درۆیە نییە کە ئاوا ژیانی تێکشکاندوە .. لە کۆی قسەکانیدا باسی لەوە کرد کە منالەکانی وەك وتراوە لە هەر باخێ گوڵێکن (پەنا بەخوا).

لاوەکەش بانگی کرد بۆ لای ئیسلام، بۆ سەر شارێگەی بەختەوەری، باسی ئەوەی بۆ کرد کە ڕزگاری هەمیشەیی لەناو ئاینی ئیسلامدایە و لەهیچ شتێکی تردا نییە ..

کچەکە بە بیستنی ئەم هەواڵە زۆر دڵخۆش بوو، لە لاوەکەی پرسی چۆن موسڵمان بم لەکاتێکدا من وەهام؟

لاوەکە پیێ ی وت: دەرگای تەوبە و پەشیمانی هەردەم کراوەیە، بە تەوبەی

ڕاست خراپەکان دەبن بە چاکە و خوای گەورە دووجار پاداشتتدەداتەوە ..

بەم هەواڵـە خۆشە و بەم قەدەرە زۆر بەختەوەر بوو، لـەگەڵ لاوەکەدا چوو بۆ گەڕەکێك کە زۆربەی موسڵمان بون.. پیّ ی ناساندن .. پاشان بەرگی بالاپۆشی کردە بەر و شوی کرد بە پیاوێکی موسڵمانی لـەخوا ترس کە بە ڕەگەز بەریتانی بوو، ئەو پیاوەش بە دوای ژنێکی ئینگلیزی موسڵماندا دەگەڕا ..

لـەکاتێکدا ئەم ژنە لـەوپەڕی ڕوخان و تێکشکاندا بوو بەڵام بە موسڵمان بونی هیوایەکی گەورەی تیادا دروست بوو کە سنوری نەبوو، ئیتر کەوتە ژیانێکی بەختەوەرەوە کە پڕی بو لـە خۆشەویستی و ڕێز.

## گەڕانەوەی خێزانێك بۆ لای خوا

ئەوان خێزانێکی موسڵمان بوون، ژیان و گوزەرانیان بە تەواوی لەسەر حەرام بوو، حەرامیان دەخوارد، دەنۆشی، دەپۆشی.

ویستی قەدەر وابوو کە ئەم خێزانە لەسەر حەرامخۆری بەردەوام نەبن و بگەڕێنەوە سەر سفرەی خواناسی و گەڕان بە دوای حەڵاڵدا.

خوای گەورە ڕۆشنایی ئیمان دەخاتە دڵی کوڕێکیانەوە، ئەویش کاریگەری دروست دەکات لەسەر سەرجەم خێزانەکەی و دەبێتە هۆکاری هیدایەتیان.

ئەم لاوە خۆی چیرۆکی هاتنەوەی بۆ ناو باوەشی باوەڕ دەگێڕێتەوە :

گەنجێتیم بە دەوڵەمەندی بەسەردەبرد، ماڵمان لە یەکێك لە گەڕەکە دەوڵەمەندەکانی قاهیرە بوو، هیچ کات سەرسفرە و خوانی ئێمە بەبێ عەرەق و خواردنەوە نەبوو، لەکاتێکدا سفرەکەمان پڕی بوو لە هەموو ڕۆزیێك کە دڵ ئارەزووی دەکات.

چاك دەمزانی کە کاروکاسپی باوکم حەڵاڵ نەبوو سوو خۆریەکەی لەولاوە بوەستێ.

ڕۆژێك لەسەر بالکۆنی خانووەکەمان دانیشتبووم لە مزگەوتەکەی دراوسێمانەوە مامۆستا ئیبراهیم کە مامۆستای مزگەوتەکە بوو ووتاری دەدا، بەجوانی گوێم لە ووتەکانی بوو، ووتەکانیم چوو بەدڵا ، ووتارەکەی زۆرخۆش بوو و توانی کاریگەری لەسەر دەروونم دروست بکات بەجۆرێك خۆم بۆ نەگیرا و هاتمە خوار و چوم بۆ مزگەوت، هەستم بە دەوروبەرم نەدەکرد وەك ئەوەی لە هەموو شتێك دابڕابێتم وامدەزانی بومەتە مرۆڤێکی تر.

مامۆستا بەم جۆرە دەدوا و باسی لە فەرمودەیەکی پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) دەکرد (ایما جسد نبت من حرام فالنار اولی به) (رواه الترمذي) واتە هەر

لەشێك لەسەر حەرام گەشەی کردبێت باشترە بچێتە ئاگرەوە.

ئەی چۆنە ئەگەر دڵێك هەر لە سەرەتاوە لێوانلێو بوبێت لە حەرامی دونیا، هەر ئەو حەرامە ژەنگی بەرەڵایی و نەفامی لەناو ئەو دڵانەدا دەچێنێت ، پاشان و لە پلەی دواتردا بە هۆی گۆرانی و بالۆرەوە کاتەکانی بە فیڕۆدەدات، لە قۆناغی چوارەمیشدا سەرقاڵی هەواو و ئارەزوو دەبێت، بە دوای ئەویشدا و لەهەنگاوی پێنجەمدا سەرقاڵی دەرچون دەبێت لە سنوری شەرع و شوێن کەوتنی هەنگاوەکانی شەیتان، لە ئەنجامی ئەم کارانەوە دەریایەك لە پیسی و قێزەون دەڕژێتە ناو کۆمەڵگاوە ، سەرەنجام وەك جورنەی گەرماو لە شوێن برینداری و درزەکانی کەڵەشاخەوە دێتە خوار ..

گۆڕانێکی سەیرم بەسەرداهات ماڵەوەم لەبەر چاو بوو بەدۆزەخ حەزم نەدەکرد بچمەوە ، حەزم نەدەکرد لەو نانە بخۆم کەلەو ماڵەدا هەیە ، دەمویست دوور لە خێزانەکەم دانیشم، تا والیهات دەهاتمە ژوور و دەچوومە دەر ، سەرباری ئەو هەموو ناز و نیعمەت و خۆراکە خۆشەی کە لە ماڵەکەماندا هەبوو حەزم دەکرد پارچەیەك پەنیر و هەندێ فەلافل بکەمە ژەمە خۆراکی نەفسم .

دایکم زۆر ناڕەحەت بوو و خەفەتی لەو بارەی من دەخوارد لە تاوا خەریك بوو گیانی دەردەچوو، دەیویست لەگەڵیان بخۆم بەڵام من ئەوەم ڕەت کردەوە، تکای زۆر لێدەکردم منیش تێم گەیاند کە ماڵی باوکم حەرامە و ئەوان حەرام دەخۆن.. حەرام دەخۆنەوە، چارەنوسی هەمومان بۆ ئاگرە ئەگەر بەمجۆرەی ئێستا بکەین و بمێنینەوە.. خواش بەرەکەت ناخاتە سامانمانەوە ، هەروەها بەرەکەت ناخاتە خواردن و خواردنمانەوە، سەرەنجام دایکم هاتە پاڵ

من، ئیتر ئێمە بەردەوام بوین لەسەر نوێژکردن.. پاشان خوشکەکەم هاتە پاڵمان، بەڵام باوکم بە ئینکاری و خۆبەزل زانینەوە سوور بو لەسەر کاری خۆی.

بە ئەوپەڕی ڕێز و خۆشەویستیەوە مامەڵەم لەگەڵ باوکم دەکرد.. هەریەك لەمن و دایکم وخوشکەکەم بەردەوام لە خوا دەپارایینەوە باوکم بخاتە سەر ڕێگەی ڕاست ، شەوانە بەدەنگی ناڵە و هاواری دایکم و خوشکەکەم خەبەرم دەبۆوە کە لە خوا دەپاڕانەوە هیدایەتی باوکم بدات و واز لە خواردنی حەرام بهێنێ.

هەتا ئەوە بوو بەیانیەك هەستام سەیرم کرد باوکم هەرچی عەرەقێکی هەبووە لە ماڵدا هەمووی فڕێی داوە و گریانێکی بەکوڵ دەگری، منی نا بە سنگیەوەو وتی:

کوڕم هەر شتێك خوا توڕە بکات لەناوی دەبەم.

کاتی نوێژ هات، لەگەڵ باوکم پێکەوە چوین بۆ مزگەوت، گوێی لە وتاری مامۆستا گرت، سوپاس بۆ خوا.. وازی لە سوو و لە عەرەق هێنا.. ئیتر ماڵەکەمان سوپاس بۆ خوا بووە ماڵێك لێوانلێو لە بەندایەتی کردن بۆ خوا.

## تەوبەی حاجیەك

لەسەر لوتکەی یەکێك لە شاخەکانی مینا کە **٣٠٠** مەتر لەسەر ئاستی ڕوی دەریاوە بەرزە بە تەنها دانیشتبوو، دەروونی گەرم بوو چاوەکانی فرمێسکی گەرم و گوڕیان دەباراند...

لێی چوینە پێشەوە و پرسیامان لێ کرد ناوت چی یە؟ هۆی چی یە وا بەتەنها ماویتەوە؟ ،بۆ بەو جۆرە بە کوڵ دەگریت؟ وەڵامی دایەوە و ووتی: (ناوێك بۆخۆم نازانم چونکە من لە ڕۆژی عەرەفەدا لە دایك بوم؟ ... ئەمەی بە وەڵامێکی زۆر گەورە زانی و بەگەورەییەوە لە دەمی هاتە دەر ...

پاشان بەردەوام بو لەسەر قسە کردن:

سەرسام مەبن لە وەڵامەکەم چونکە بۆ ماوەی سی ساڵ من کۆیلەی مادە سڕکەرەکان بوم، لەو ماوەیەدا تامی هیچ خواردنێکم نەکردوە جگە لە حەب و دەرمانی کەبتاجون و حەشیش و مادەی سەرخۆشکەر....

ئەمە چیرۆکی (خ .م .حەربی تەمەن ٤٠ ساڵ) ە ئەو لەوێ دانیشتبوو و چیرۆکەکەی بۆ (عکاظ) دەگێڕایەوە، چیرۆکیك کە پڕی بوو لەبابەتی خەمناك و بە بیستنی مرۆڤی سەرسام دەکرد، باسی لەوە کرد کە چۆن هاوەڵانی خراپ بەرەو داڕوخانیان برد و بۆ بنی زەلکاو پەلکێشیان کرد.

حەربی دەڵێت:

من باوکی پێنج منالم (ڕامی وڕیم وڕەیان و روان و ڕەهام)، لەگەڵ باوکم لە ناوچەی قەسیم دەژیام، لۆریەکم پێ بوو لە نێوان شارەکانی مەملەکەدا خەریکی شۆفێری بووم، ڕۆژیك یەکێك لە هاوەڵە شۆفێرەکانم بیرۆکەی خواردنی حەبی تلیاکی بۆ باسکردم کە گوایە دەبێتە هۆی زیادکردنی ووزە و

چالاکی و ئارامی زیاترت پێ دەبەخشێت، بەهۆیەوە دەتوانی بەرگەی شەونخۆنی بگریت بەدرێژایی گەشتەکەت.

هەرچەندە لە سەرتادا ڕەتم کردەوە بەڵام ئەو کۆڵی نەداو چەندجار ئەو داوایەی دووبارە کردەوە، ڕۆژانە وبەبەردەوامی زۆری لێ دەکردم .

زانیاریم لەسەر ئەو حەبە نەبوو کە چەندە مەترسیدارە لەبەر ئەوە بەلامەوە ئاسایی بوو کە وەك تاقیکردنەوە بەکاریبهێنم کە ئەمەش بووە سەرەتای تێکەوتنم، سەرەنجام و بەدرێژایی بیست ساڵ ڕۆژانە هەزارجار دەمردم و زیندوو دەبومەوە.

ئەم ژەهرە هاتە ناو خوێن و جەستەمەوە و کاریگەری لەسەر هۆشم دروستکرد، بومە دڕندە و بەبەرچاوی منداڵەکانمەوە لە خێزانەکەم دەدا، ئەوانیش سامیان لێ دەنیشت کاتێك باوکیان بەو شێوەیە دەبینی پەلاماری دایکیان دەدا.

لەبەرامبەردا ژنەکەم کۆڵی نەدەدا و بەردەوام هەوڵی لەگەڵ دەدام کە واز لە تلیاك بهێنم بەڵام بێ سوود بوو چونکە لەوساتەوەی کە فێری کێشانی بوبوم هەموو هەستێکم لەدەستدا بوو.

بۆ ماوەیەك بێدەنگ بوو ...

فرمێسك بە تاو لەچاوەکانی حەربی دەهاتنە خوار کە هەستی پەشیمانی لێ دەخوێنرایەوە، لەکاتێکدا سەری شۆڕکردبۆوە بەسەر زەویدا و خەریکی سڕینی فرمێسکەکانی بوو ، خێرا خێرا هەناسەی قوڵی هەڵدەکێشا...

ئێستاش ئەو ڕۆژەم لە بیرە وەك ئەوەیە دوێنێ بێت کاتێك هەندێك لە دراوسێکان میوانم بوون، ڕامی کوڕم هاتە ژوور لە کاتێکدا پارچەیەك حەشیشی بەدەستەوە بوو کە لە یەکێك لە ژوورەکان دۆزیویەوە.. بەپرسیارەوە ڕوی

تێکردم (باوکە ئەمڕۆ حەشیشت نەخواردۆتەوە)!

چەندە خۆش بوو بۆمن ئەگەر لەو کاتەدا زەوی شەقی ببردایە و بکەوتمایە ناوی، بەوەندەوە نەوەستا ڕامی (١٥ساڵ) و ڕیم (١٤ساڵ) هاتنە ژوورەوە بۆلام بۆ گلەیی کردن (باوکە هەتا کەی ئێمە ناتوانین لە لات دانیشین و قسەت لەگەڵ بکەین.. تۆ کەی واز لەم ژەهرە دەهێنی؟ کەی واز لە لێدانی دایکمان دەهێنی؟ دوای ئەوەی کە ئەم هەموو ساڵە لەگەڵتدا دەژی ؟ باوکە ئێمە گوناهمان چییە؟

کەوتمە سەرزەنشت کردنی خۆم بە جۆرێك لەو شەوە بەدواوە لەزەتم لە خەو نەکرد.. لە مل ملانێیەکی توندا ژیام، لە نێوان ئارەزوویەکی ڕاستەقینەدا بۆ دەرچون لە دۆزەخی تلیاك و هەوڵی بەردەوامی هاوەڵە خراپەکانم بۆ مانەوە تیایدا بە بیانوی ئەوەی کە ئەمە قەدەری ئێمەیە و ناتوانین لێی دەرچین.

بەم جۆرە لەناو ئەم کێشە دەرونیەدا مامەوە کە زۆر تاڵ و ناخۆش بوو هەتا ئەوە بوو خوای گەورە لە گەڕەکەکەماندا دوو کەسی لە ئەهلی خێر و چاکە بۆ ناردم کە دەستیان گرتم بۆ سەر ڕێگەی هەق و ڕاستی و بەختەوەری دونیا و قیامەت.

ئەوەتا ئەمڕۆ من لە سەر خاکی پیرۆزم و ئەرکی حەج جێ بەجێ دەکەم و لە خوا دەپاڕێمەوە کە لەو تاوانانەم خۆش بێت کە بەهۆی بێئاگاییمەوە تووشم بوون.

ئەم فرمێسکانە جگە لە پەشیمانی و تەوبەی ڕاست هیچی تر نی یە، داواکارم لە خوای دلۆڤان ببێتە هۆی سڕینەوەی ئەو ژەهرانەی کە بەردەوام و بە درێژایی بیست ساڵ بەناو خوێنمدا هاتوچۆی کرد.

دوای ئەم وتوێژە دوعا خوازیمان لە حەربی کرد .. وازمان لێهێنا هەتا بە زەلیلی بگری .. درێژە بە پاڕانەوەکانی بدات و دەست بەرز بکاتەوە بۆ ئاسمان بۆ لای عەزیز و غەفار .. وە ئێمەش لە دڵمانەوە دوعامان بۆ کرد کە تەوبەی نەصوح بکات.

پێغەمبەر (صلى الله علیه وسلم) ڕاستی فەرمووە "انما مثل الجلیس الصالح و الجلیس السوء کحامل المسك و نافخ الکیر، فحامل المسك اما ان یحذیك واما ان تبتاع منه و اما ان تجد منه ریحا طیبة، و نافخ الکیر اما ان یحرق ثیابك و اما ان تجد منه ریحا خبیثة" متفق علیه.

سەرچاوە:محمد مداری (بعثة عکاظ – المشاعر) الاثنین ١٤٢٥/١٢/١٤.

## خۆشترین چیرۆك

خوای گەورە دەفەرموێت "انك لاتهدي من احببت ولكن الله يهدي من يشاء وهو اعلم بالمهتدين" القصص ٥٦

خاوەنی ئەم چیرۆکە سەیرە خەڵکی شارەکەی پێغەمبەرە (صلی الله علیه وسلم) ، ئەگەر خۆی بۆی نەنوسیمایە ئەوا بە ئاسانی باوەڕم نەدەکرد کە شتی وەها ڕوبدات.

بەم جۆرە بۆمان باس دەکات:

من گەنجێکم پێم ناوەتە بەهاری سی و حەوت ، خاوەن ماڵ و خێزانم ، خۆم لەوکارە حەرامانەی کە خوای گەورە قەدەغەی کردووە دوورە پەرێز نەدەگرت، تەنانەت نوێژەکانیشم بە جەماعەت نەدەکرد مەگەر لەکاتی بۆنەکاندا و ئەوەش لەبەر دەورووپشتم، هەموو ئەمانەش لەبەر ئەوە بوو کە تێکەڵاوی و هاوڕێیەتی کەسانی خراپم دەکرد و بوو بوومە هاوەڵی شەیتان .

خوای گەورە کوڕێکی پێدابووم بەناوی مەروان، تەمەنی حەوت ساڵان بوو ، کەڕولاڵ بوو ، هەتا لێی خواناس بوو لەبەر ئەوەی بەشیری مەمکی دایکە ئیمانداره‌کەی گۆش کرا بوو.

شەوێك دوای نوێژی ئێوارە بیرم لەوە دەکردەوە لەگەڵ هاوەڵەکانم چی بکەین و بچین بۆ کوێ، ئەو شەوە هەر من و مەروان لەماڵەوە بوین، مەروان بە کۆمەڵێك هێما کە هەر خۆم و خۆی تێدەگەیشتین قسەی لەگەڵ دەکردم ، ئاماژەی بۆ ئەوە دەکرد باوکە بۆچی نوێژ ناکەیت؟! پاشان دەستی بەرز کردەوە بۆ ئاسمان و هەڕەشەی ئەوەی لێ کردم کە خوا دەتبینێت چونکە هەندێ کات منی بە کاری خراپەوە دەبینی، سەرسام بوم بە قسەکانی،

لەبەردەممدا دەستی کرد بەگریان، منیش هێنامە لای خۆمەوە بەڵام ڕایکرد لە دەستم، دوای ماوەیەکی کەم چوو دەستنوێژی هەڵگرت، هەرچەندە دەستنوێژی باش نەدەزانی بەڵام لە دایکیەوە فێر بوو بوو، هەموو قورئانی پیرۆزی لەبەر بوو، بەردەوام ئامۆژگاری دەکردم بەڵام بێ سوود بوو.

پاشان هاتە ژورەوە بۆ لام و بە هێما ئاماژەی پێدام کە ماوەیەك چاوەڕوانی بم، دەستی کرد بە نوێژ، پاشان قورئانەکەی هێنا و لەبەردەمیدا داینا و ڕاستەو خۆ کردیەوە بەبێ ئەوەی پەڕەکانی ئەمدیو و ئەو دیو بکات، یەکسەر پەنجەی خستە سەر ئەم ئایەتە لە سورەتی مەریەم:

{يَا أَبَتِ إِنِّي أَخَافُ أَن يَمَسَّكَ عَذَابٌ مِّنَ الرَّحْمَن فَتَكُونَ لِلشَّيْطَانِ وَلِيّاً}مريم٤٥

پاشان دەستی کرد بە گریان، منیش زۆر گریام لە گەڵیا، هەستا و فرمێسکەکانی لە چاوم سڕی پاشان دەست و سەری ماچ کردم، دوای ئەوە بە هێما پێی ووتم ( باوکە نوێژ بکە بەر لەوەی بخرێیتە ناو گڵەوە.. پاشان گیرۆدەی سزا ببیت ..) منیش سوێند بەخوای گەورە کە هەر خۆی دەزانێ لە ترسدا هۆشم نەبوو، یەکسەر هەستام و هەموو گڵۆپەکانیماڵەوەم هەڵکرد، مەروانی کوڕیشم ژوراو ژوور بە دوامەوە بوو و بەسەرسوڕمانەوە سەرنجی دەدام بە هێما پێی دەووتم (واز لە گڵۆپەکان بهێنە و بچۆ بۆ مزگەوتی گەورە) مەبەستی لە مزگەوتی پێغەمبەر بوو (صلى الله عليه وسلم)

پێم ووت دەچین بۆ مزگەوتەکەی دراوسێمان.. جگە لە حەرەمی شەریف هیچی تری قبوڵ نەبو، منیش بردم بۆ ئەوێ لەکاتێکدا ئەو بەردەوام سەرنجی دەدام و منیش ترسێکی زۆر بەسەرمدا زاڵ بوو بوو، بەوجۆرە چوینە مزگەوتی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) پاشان چوینە ڕەوزەی شەریف کە پڕی بوو لە

خەڵك، کاتی نوێژی خەوتنان بوو.. ئیقامەی نوێژ کرا، ئیمام ئەم ئایەتی دەخوێندەوە:

{يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا لَا تَتَّبِعُوا خُطُوَاتِ الشَّيْطَانِ وَمَن يَتَّبِعْ خُطُوَاتِ الشَّيْطَانِ فَإِنَّهُ يَأْمُرُ بِالْفَحْشَاء وَالْمُنكَرِ وَلَوْلَا فَضْلُ اللَّهِ عَلَيْكُمْ وَرَحْمَتُهُ مَا زَكَا مِنكُم مِّنْ أَحَدٍ أَبَداً وَلَكِنَّ اللَّهَ يُزَكِّي مَن يَشَاءُ وَاللَّهُ سَمِيعٌ عَلِيمٌ}النور٢١

لەبەر زۆری گریان خۆم بۆ ڕاگیر نەدەکرا.. مەروانیش کە لە تەنیشتمدا بوو وەك من دەگریا، لەکاتی نوێژەکەمدا مەروان دەسرێکی لە گیرفانم دەرهێنا و فرمێسکەکانمی دەسڕی، دوای نوێژیش بەردەوام فرمێسکەکانی بۆ دەسڕیم، کاتژێرێکی تەواو لە حەرەمدا دانیشتم هەتا مەروان پێی ووتم "تەواو باوکە مەترسە.." هەستم کرد کە ئەو خەمی منیەتی لەبەر زۆری گریان.

پاشان گەڕاینەوە بۆ ماڵ ئەو شەوە یەکێك بوو لە شەوە گەورەکان هەستم کرد لەو شەوەدا جارێکی تر لە دایك بوم.. ژنەکەم و منداڵەکانم هاتن.. هەمویان دەگریان بەڵام نەیاندەزانی کەچی ڕویداوە.. هەتا مەروان بە هێما پێی وتن کە باوکم لە حەرەم نوێژی کردووە.

خێزانەکەم بەم هەواڵە زۆر خۆشحاڵ بوو چونکە ئەوە بەرهەمی پەروەردەی خۆی بوو، ڕووداوەکەم بە تەواوی بۆ گێڕایەوە، پاشان سوێندم داو لێم پرسی کە تۆ ئامۆژگاری مەروان"ت کردبوو ئەو قورئانە بهێنێ و ئەو ئایەتەم نیشان بدات؟

ئەویش سێ جار لەسەریەك سوێندی خوارد کە شتی وەهای نەکردوە، پاشان سوپاسی خوای کردم کە هیدایەتی پێ بەخشیم ، ئەو شەوە خۆشترین شەو بوو لە ژیانمدا.

ئێستا بەکۆمەڵ نەبێت لە مزگەوت نوێژ ناکەم، وازم لە هاوەڵە خراپەکانم هێناوە و ئێستا چێژی باوەڕم نۆشیوە، هەرکەس بمبینێ لە دەموچاومدا هەست بەوە دەکات، لەمەش زیاتر هەست بە خۆشیەکی گەورە دەکەم، خۆشەویستی لەیەك گەیشتن لە نێوان من وخێزانم و منداڵەکانمدا بەتایبەت کوڕەکەم مەروانی کەڕولاڵ کە زۆرم خۆشویست.. چۆن خۆشم نەوێت لە کاتێکدا هیدایەتی من لەسەر دەستی ئەو بوو.

## نامەیەك لە کچێکی ئەمریکیەوە

نامەیەك لـە کچێکی ئەمریکیەوە بۆ کچانی موسڵمانی هاوڕەگەزی خۆی

### چیرۆکەکەم لەگەڵ ئیسلامدا

لـە نامەکەیدا نوسیبوی:

السلام علیکم خوشکە موسڵمانەکانم، ئەی ئەوانەی هەڵگری ئیسلامی جوانن، بزانن کە ئیسلام تاکە ئاینە...

چیرۆکی من لێرەوە دەست پێدەکات کاتێك ویستم ئاینێك هەڵبژێرم لێکۆڵینەوەم لـەسەر ١٢ ئاین کرد بەڵام تەنها ئیسلامم هەڵبژارد، هەر لـەسەرەتادا ئەو هەستەم هەبوو کە ئیسلام بەرەو لای خۆی کێشم دەکات.

لـەکاتێکدا ئەم نامەیە دەنوسم چاوم پڕە لـە فرمێسك بۆ بیست ساڵ تەمەنی ڕۆیشتووم کە لـە بێهودەیی و دوور لـە خوا بەسەرم برد، دەمەوێ ئەو ڕاستیە بڵێم : بەر لـە موسڵمان بوونم هەستم بە گرنگی ئاین دەکرد لـە ژیانی مرۆڤەکاندا ، بەڵام ئێمەی ئەمریکی نامانەوێت گەواهی ئەو ڕاستیە بدەین.

چیرۆکی من لـەگەڵ ئیسلامدا بەم جۆرە دەستی پێکرد: کچێکی موسڵمانم ناسی کە خەڵکی سعودیە بوو تەمەنی لـە بیست ساڵ تێپەڕ نەبوو بوو، ئەوەش بەو هۆیەوە بوو کە هاتە لام و بە زمانێکی پاراو داوای لێکردم کە یارمەتی بدەم لـە زمانی ئینگلیزیدا.

هەرچەندە سەرسامی ئەو پەیوەندیە خێزانیـیە بووم کە موسڵمانان هەیانە و کەسانی وەك منیش لـە تەمەنی یەك ڕۆژەوە لێ بێ بەشن، لـە مانگەکانی سەرەتای وانەکاندا هیچ گرنگیەکم بە ئاینەکەی نەدا لـەگەڵ ئەوەی خۆشەویستیەکی زۆرم بۆ خوو و نەریتی موسڵمانان هەبوو.

بۆ ماوەی پێنج مانگ لێ ی دابڕام تەنها لەو ماوەیەدا و لەکاتی تاقیکردنەوەکاندا لە هەندێ بابەتدا یارمەتیم دەدا.

بە درێژایی ئەو ماوەیە بە قوڵی بیرم لەو دەکردەوە، بالاپۆشێکی ڕەشی لەبەر دەکرد بە جۆرێك کە هەموو لەشی دادەپۆشی هەتا دەموچاوە جوانەکەی ..

دوو خوشکی هەبوو زۆر گرنگیان پێ دەدام و ڕێزیان لێ دەگرتم بە جۆرێك هەندێك جار شەرمەزار دەبووم لە ئاستیاندا .. هاوڕێکانم لە زانکۆ پێیان دەوتم:

موسڵمانە نەزانەکانت چۆن بینیە زیاتر خەمبار دەبوم بە هۆی تێنەگەیشتنی ئەوانەی چوار دەورم و ئەوەش کە لە ناخمدا بوو، ئەو هەستەم لا دروست بوو کە موسڵمانان خاوەنی شتێکن لەکەسانی تریان جیا دەکاتەوە، لەگەڵ بونی ئەو هەموو پڕوپاگەندە و چەواشەکردنانەی کە کەناڵەکانی ڕاگەیاندن بەرامبەر موسڵمانان دەیکەن، بەڵام ئێمەی ئەمریکی سەرسامین بە ڕوخساری دەرەوەی موسڵمانان ئەگەر ئەم هەستەش ئاشکرا نەکەین.

ڕۆژی یەك شەممە بوو باران دەباری چووم بۆ کەنیسە بۆ ئەوەی وەڵامێکم دەست بکەوێت !؟ وەڵامی ڕاستی خوا، چووم هەتا نهێنی دەرونی خۆم لای کچە ڕەبەنێکی هاوڕێم هەڵڕێژم ، خۆم کرد بە ژورێکی بەتاڵدا کە تەنها خاچێکی پێوەهەڵواسرابوو:

"خودایە هەرتۆ ئاگاداری نارەحەتیەکانی ناودڵی منی ، یارمەتیم بدە خودایە تۆ کوڕت هەیە ؟!(پاك وخاوێنی بۆ خوا لەوەی وتم).. تۆ فرمێسکەکانم دەبینی و سەرسامی من دەزانی.. دوای کام لەو ١٢ ئاینە بکەوم؟

حەز دەکەم ببمە موسڵمان.. بالاپۆشێکی درێژی ڕەش لەبەر بکەم و بەناو شەقامەکاندا بڕۆم.. شوبکەم بە پیاوێکی عەرەب هەتا بەڕێزو ئازادیەوە بژیم.

زۆر گریام هەتا ئەوە بوو هاوڕێکەم هات وتی:

ئەوە بۆ یەسوع دەگریت کە چۆن لە خاچیاندا؟

هەستم بە هیلاکی و ماندوو بونێکی زۆر کرد، هەستم دەکرد دەڕوخێم و تیادەچم .. لەوە زیاتر خۆم بۆ نەگیرا کەوتمە سەر زەوی ودەستم بەگریان کرد.. لە کاتێکدا دەستم بەرەو لای خاچەکە درێژ کرد بوو ووتم:

jane قسە بکە ئایا ئەوەی کە باوەڕمان پێیەتی لەبارەی ئەم خاچەوە ڕاستە؟ من سەرسامم! کێ خوایە؟ تۆ باوەڕت وایە کە خوا سێ دانەیە (ثالث ثلاثة)؟

لەوە زیاتر بەرگەی ئەم درۆیە ناگرم.. ڕاستیم پێ بڵێ.. پێویستە شوێن چ دینێك بکەوم ؟ وە بۆچی شوێنی بکەوم؟

Jane قسەکەی پێ بڕیم لەکاتێکدا سەرسام بوو وتی:

خۆشەویستم مافی خۆتە کە ئەم پرسیارانە بکەیت، هەزاران جار ئەم پرسیارانەم لە خۆم کردوە! پاشان دەستی گرتم و وتی:

بەڵام من دوای ئەم هەموو گومانە ئینجیل هەڵدەگرم و هەموو ئەم پرسیارانە لە یاد دەکەم کە شەیتان دەیخاتە دەرونمەوە..

سەیرم کرد و پێم وت : ئای کە چەندە فێڵبازیت ..

جێگاکەم بەجێهێشت و نەمدەزانی بەرەو کوێ بچم و ڕوو لە کوێ بکەم، هەندێك پیاوم بینی بە پۆشاکەکانیاندا لە موسڵمان دەچوون.. بە پەلە چوم بۆ لایان.. ووتم "تکا دەکەم.. تکا دەکەم"

گریان بەری قوڕگی گرتم:

لە کوێ ئەتوانم موسڵمانان ببینم؟

بە گەرمیەوە کە پڕ بوو لە خۆشەویستی پێیان وتم (وەرە لەگەڵمان ئێمە بۆ نوێژ دەچین بۆ ئەوێ)

لەبەر ئەوەی پەلەم بوو ووتم" نەخێر ئەتوانم بە تەنها بچم، تەنها پێم بڵێن ناوەندی ئیسلامی لە کوێیە؟"

بەگەیشتنم بۆ ئەوێ و چونە ژوورەوەم ئارامیەك دەروونی گرتم، هەستم بە هێمنی دەکرد ، هەستم بە شەرمەزاری دەکرد ئەویش بە بینینی ئەو خوشکە بالاَ پۆشانەی کە لەوێ بوون لەکاتێکدا کە من پۆشاکی کورتم لەبەردا بوو miniskirt .

لەوێ پۆشاکی تایبەتی نوێژم بینی کە دانرابوو، لە دەرونی خۆمدا ووتم "بۆ دانەیەکیان نەدەم بەسەر قاچمدا".

خوشکێك هاتە لام دوای ئەوەی بەخێرهاتنی کردم ووتی:

حەز دەکەیت شتێك لەبارەی ئیسلامەوە بزانیت؟"

ووتم "بەڵێ ، حەز دەکەم ئیسلامم پێ بناسێنی .. تکایە"

ووتی" زۆرم پێخۆشە، بەڵام هیچت لەسەر ئیسلام خوێندۆتەوە؟"

بە دودڵیەوە وەڵامم دایەوە "بەڵێ زۆرم خوێندۆتەوە، من مامۆستایەکی ماڵەوەم و وانەی تایبەتی بە کچێکی موسڵمانی سعودی دەڵێمەوە"

ووتی "زۆرباشە، پێم خۆشە کە سەردانم بکەیت بۆ ماڵەوە، تا شتێکت لە بارەی ئیسلامەوە فێر بکەم"

لە خۆشیا گریام .. ووتم "سوپاس .. سوپاس"

بە زمانێکی عەرەبی نارێك و بەشێوەیەکی ناتەواو ئەو ووشانەم دەربڕی.

بۆ ماوەی دوو مانگ بەردەوام بوم لە سەردان کردنی ماڵەوەیان، هەتا هەواڵێکی ناخۆشم پێگەیشت.. کە مامۆستاکەم خۆی ئامادە دەکات بۆ سەردان کردنەوەی وڵاتەکەی، لەبەر ئەوە نەیدەتوانی لە گەڵمدا بەردەوام بێت.

ئەم سەردان کردنە دوو مانگی خایاند ، هەواڵم زانی کە مامۆستاکەم خۆی

ئامادە دەکات بۆ سەردانی کەسوکار و وڵاتەکەی ، بەم هۆیەوە لەیەکتر دادەبڕاین کە ئەمە هەواڵێکی ناخۆش بوو بەلامەوە.

کاتی جیابونەوە بۆ من زۆر سەخت بوو ، بە گریانەوە دوعا خوازیم لێکرد.

لەبەر سەرنجی هەریەك لە هاوڕێکانم و کەسوکارەکەم توانای ئەوەم نەبوو بەردەوام سەردانی ناوەندی ئیسلامی بکەم..

گەڕامەوە ماڵ. وەك چۆن موسڵمانەکانم بینی بوو بەو جۆرە سوجدەم برد.. سەرم خستە سەر زەوی ، دڵم پڕ بوو لە گریان و ووتم "خوایە کەسێك بنێرە یارمەتیم بدات.. خوایە من ئیسلامم خۆش ویست و بڕوام پێهێنا فورسەتی موسڵمان بوونم لە دەست مەدە، ئەگەر بۆ ڕۆژێکیش بێت بەر لەوەی بمرم .."

ڕۆژێك زەنگی تەلەفونی ماڵەوە لێیدا، هاوڕێ کوڕەکەم بوو boyfriend ووتی "ئاهەنگێکمان هەیە ئەمڕۆ لە گەڵما دێیت"

ووتم "حەزم دەکرد بەلام ناتوانم"

لە دوای ئەو ڕۆژەوە نەمدیەوە تەنانەت گوێم لە دەنگیشی نەبوو، لە هاوەڵە سعودیەکەم بیستبوو کە boyfriend لە ئیسلامدا بەبێ بونی گرێ بەستی هاوسەری حەرامە..

دوای داخستنەوەی تەلەفونەکە چومە ژورەکەم.. دیاری هاوڕێ سعودیەکەم بیرکەوتەوە کە بالاپۆشێك بوو،چووم دەرم هێنا ، بەو جۆرەی ئەو لەبەرم کرد، پاشان خستمەوە شوێنی خۆی .

پاش مانگێك دوای خوێندنەوەی هەندێك کتێب لەبارەی ئاینی ئیسلامەوە دڵم پڕ بوو و گریام، بەوجۆرە لەسەر قەنەفەی ژوری دانیشتن خەوم لێکەوت..

کاتژمێر هەشتی شەو بوو بەهۆی زەنگی تەلەفونەوە بە خەبەر هاتم، هاوڕێ

سعودیەکەم بوو پیِّی ووتم "سارا نوستبوویت؟"

"بەڵێ، بەڵام گرنگ نی یە.. تۆ چۆنی؟" کوتوپڕ گریام .

"سارا چیتە .. هیچ شتێك هەیە ئازارت بدات ؟ ئەوە چی یە؟"

" هاوڕێ گیان گوێم لێبگرە، من ماندووم بەدەست ئەم دڵەڕاوکێیەوە، هەست دەکەم شتێکی نامۆ بە ناخمدا دێت و دەچێت.. ئەتوانم ئەمشەو بێم بۆ ماڵەوەتان؟ هەست دەکەم ئەمڕۆ دوا ڕۆژمە."

"سارا گیان ئەوە کەی قسەیە ماڵ ماڵی خۆتە، هە کات دێیت بەخێر بێیت ."

هەستم بە دڵتەنگی دەکرد ، ئازاری سەرم زیادی دەکرد و تاکەم بەرز دەبۆوە بە جۆرێك لە تیاچونەوە نزیك بووم ، بەڵام ئەمجارە جیاوازە چونکە هەر کات بەم ئەندزەیە هەستم بە ڕوخان بکردایە بیرم لەخۆکوشتن  دەکردەوە، بەڵام ئەمجارە تەواو جیاوازە ...!

هەستم کرد کە من دەمهەوێت شتێکی لەوە گەورەتر بکەم ئەویش (گۆڕانە).. سوار ئوتومبێلەکەم بووم لەبەر زۆری ئەو دڵتەنگیەی کە پێوەی دەمنالاند وەخت بوو خۆم بدەم بە زۆر ئوتومبێلی تردا..

لەگەڵ ئەو دەرون بلاویەم کە بۆ چوار مانگ دەچوو تەواو شانی گرتبووم گەیشتمە ماڵی هاوەڵەکەم، برا گەورەکەی دەرگاکەی کردەوە و وتی "سەلاموعەلەیك سارا"

وەلامی سەلامەکەیم دایەوە وەك چۆن ئەو هاوڕێیەم کە گەشتی کرد فێری کردبووم، بەڵام هەرچۆن بوو ئەو وای هەست کرد کە لە شتێك دەترسم...

دەنگی هاوڕێکەم بێدەنگیەکەی شڵەقاند وتی "بەخێر بێیت سارا، فەرموو"

چومە ژورەوە لەکاتێکدا زۆر شت لە ناخمدا بوو.. لە ناخمدا ئاگرێك هەلایسابوو کە بۆ ماوەی چەند هەفتەیەك بەڵکو چەند مانگێك دەبوو

نەکوژابۆوە .. بەڵکو دەتوانم بڵێم لەو کاتەوەی کە گەشتی ئەم دونیایەم دەست پێکرد بوو!

پێکەوە دانیشتین ، قاوەی عەرەبی پێشکەش کردم کە جوانترین شتە لە میوانداری سعودیەدا.. قاوەکەم خواردەوە.

لەو کاتەی هاتبومە نێو ئەم ماڵە گەرمە هەستم بە ئارامیەك دەکرد کە بە درێژایی ژیانم عەوداڵی بووم .. لەگەڵ هاوەڵەکەم کەوتینە وتووێژ لە بارەی ئەوەی لە ناخمدا هەیە، دوای وتووێژێکی دووردرێژ پێی ووتم :

"تۆ ئامادەییت موسڵمان بیت؟"

"بەڵێ .. بەڵکو ئێستا ئەوەم دەوێت"

"پەلە مەکە لە بڕیارێکی وەها گەورە."

"ئەو هەستەم هەیە کە ئەم دینە دینێکی ڕاستە، بەڵکو لەوە دڵنیام .. پەلە بکە خوشکم، پێم بڵێ چۆن موسڵمان ببم؟"

"ئێستا دەتوانی موسڵمان ببیت، تەنها بڵێ اشهد ان لا الـه الا الله واشهد ان محمدا رسول الله"

"باشە ووشە ووشە فێرم بکە"

بە دەنگی بەرز بە دوایدا دەمووتەوە لەکاتێکدا لێدانی دڵم بەخێراییەکی زۆر زیادی دەکرد و فرمێسك لە چاوم دەهاتە خوار .. "اشهد .. ان .. لا الـهالا الله .. واشهد .. ان .. محمدا رسول الله"

سەیرێکی هاوڕێکەم کرد و بەدەنگی بەرز پێم ووت:

من موسڵمانم .. من موسڵمانم .. من موسڵمانێکی نوێم .. ئەمڕۆ لە نوێ لە دایك بومەوە .. ئەمرۆ ناوم "موسڵمانە" .. لەمڕۆ بە دواوە بە "سارا" بانگم

ناکەن .. بەڵکو بە موسلیمە بانگم دەکەن .. بە دوعا (سارا)ی کۆن .. خواحافیز دڵەڕاوکێ و سەرگەردانی .. لەمڕۆ بە دواوە پێویستیم بە بیرکردنەوە نی یە لە تەسلیس .. لەمڕۆ بەدواوە من تاوانبار نیم .. من موسڵمانم!

دوای ئەوە گەڕامەوە ماڵ .. دەروونم ئاسودە بوو .. بەڵام نەمتوانی بنوم ئەوەش لەبەر دڵەڕاوکێ نەبوو.. بەڵکو لەبەر ئەوەی دڵخۆش بووم.

بە قیبلەنماکەم ئاراستەی ڕووگەم دۆزیەوە .. بەرماڵی نوێژم ڕاخست و یەکەم نوێژم لە ئیسلامدا کرد کە نوێژی خەوتنان بوو چونکە کاتەکەی هێشتا تێپەڕ نەبوو بوو.. لە سوجدەی کۆتاییدا بۆ ماوەی سی (٣٠) خولەك مامەوە، لە کاتێکدا کە زۆر بە دڵخۆشیەوە دەگریام.. لە خوا دەپاڕامەوە کە یارمەتیم بدات و لەسەر هەق دامەزراوم بکات.

ئەمڕۆ مێژووی لە دایك بونم بوو ١٩٩٩/٧/١٦م، ناوم "مسلمە"یە و وێنەی پێناسەکەم گۆڕی بە وێنەیەکی بالاپۆش ..

بە ڕۆژگارێکی سەخت و دژواردا گوزەرم کرد ئیتر کاتی ئەوە هاتووە پشوو بدەم.. ببمە کەسێکی بڕوادار.. دوای بیست ساڵ لە سەرلێشێواوی و تیاچوون.

تەلەفونم بۆ ئەو هاوڕێیەم کرد کە چوو بۆوە بۆ سەردانی کەسوکاری، هەواڵی موسڵمان بونی خۆمم پێدا.. زۆر دڵخۆش بوو.

لێرەدا چیرۆکەکە تەواو نەبوو.. ناڕەحەتیەکی تر هات ئەویش چۆنیەتی گەیاندنی هەواڵەکە بوو بە کەسوکارم.. بەڵام خۆم گرت هەتا کاتی جەژنەکانی لە دایك بوون هاتنە بەرەوە.. بالاپۆشەکەم لەبەر کرد و دایك و باوکم و تاقە براکەم هاتن بۆ لام..

"سارا .. ئەوە چی یە؟" براکەم هاواری کرد..

لە کاتێکدا فرمێسك بەر چاوی گرتبوم پێم ووت " ئەمە بالاپۆشە .. ئەمڕۆ

من موسڵمانم .. ناوم (موسلمە)یە نەك سارا."

دایکم سەرسام بوو.. ڕەنگی دەموچاوی گۆڕا ووتی"ئازیزەکەم تێکچویت؟ چۆن ڕازی دەبیت ئیسلام بکەیت بە دینی خۆت؟!"

پێم ووت "ئیسلام دینی منە و موحەمەد (صلی الله علیه وسلم) پێغەمبەرمە و الله خوا و پەروەردگارمە، قورئان کتێبمە، و خەدیجە و عائشە پێشەوامن، ئەمریکا وڵاتمە، تۆش هێشتا ماری دایکمی، تۆش هەروەها جۆنی باوکمی و ئەوەش مارك برا خۆشەویستەکەمە .. ئێوە خێزانە خۆشەویستەکەی منن، هیچ شتێکی تازە نی یە جگە لەوەی کە من گۆڕاوم و بوومەتە موسڵمان.. من ئێستا زۆر خۆم بە بەختەوەر و ئارام دەزانم .. هەست دەکەم کە من مرۆڤم .. هەست دەکەم سەربەستم ..

دایك و باوکم زۆر بەگەرمی گرتە باوەش لە کاتێکدا کە نیشانەی سەرسوڕمان بە دەموچاویانەوە دیاربوو .. دایکم ووتی: خۆشەویستم خەمبار مەبە بەڵام پێم بڵێ ئەمە چی یە کە لەبەرت کردووە؟

"ئەمە پۆشاکی منە .. خۆشم ئەوێت و هەرگیز ناتوانم دایکەنم .. ناتوانم.."

"بەڵام خەڵك چی دەڵێن؟ دەڵێن ئیتر قژە جوانە ئاڵتونیەکەی سارا نابینین"

"دایە ئەوە گرنگ نی یە .. گرنگ ئەوەیە من موسڵمانم"

بەم جۆرە تاقیکردنەوەکەم بڕی و سوپاسی خوام کرد لەسەری.. دوای ڕۆیشتنی ئەوان بۆ جەژنی لە دایك بوون نامەیەکم نوسی لەگەڵ سێ چڵ گوڵی سپی .. تیایدا نوسیم:

"دایکە، باوکە، براکەم .. هەموتانم خۆش دەوێت و هێشتا من هەر کچی ئەم خێزانەم .. هێشتا ئەمریکیم .. تکا دەکەم وەك موسڵمان وەرم بگرن، زۆر

سەرسام بووم بەو دیاریانەی کە بۆتان هێنابووم .. بەڵام دەمهەوێت هەواڵتان بدەمێ کە من بۆ ساڵی داهاتوو ناتوانم ئاهەنگتان لەگەڵدا بگێڕم .. دەزانم ئەمە وەك هەواڵێکی ناخۆش دەردەکەوێت بەڵام ئەو دیاریانە قبوڵ دەکەم کە بۆم دەهێنن.. دایکە بزانە هێشتا تۆم خۆش دەوێت ..

باوکە بزانە هێشتا تۆم خۆش دەوێت .. برام بزانە هێشتا تۆم خۆش دەوێت ..

خۆشەویستیم بۆتان

موسلمە

ئەمە چیرۆکی منە چیرۆکی لە دایك بونەوەی نویێ.. تکا دەکەم لە خوشکانم لەڕێ خوادا لەکاتی دوعا کردنا منتان لەیاد نەچێت.. تکا دەکەم لە دڵەوە نزام بۆ بکەن..

بەر لەوەی ئەم نوسینە دوایی بهێنم هەواڵتان دەدەمێ کە دایکم ئەمشەو شەهادەی خۆی ڕاگەیاند .. ئەویش موسڵمان بوو!

بەڵێ شەوی ڕابردوو دایکم موسڵمان بوو! ئەمەش کاتێك ڕویدا کە دایکم داوی لێکردم لەگەڵیدا بچم بۆ سەر ڕوبارێکی نزیك .. لەگەڵیدا چووم بەڵام توشی سەرسامی هاتم کاتێك سەیرم کرد دایکم بەرەو ناوەندی ئیسلامی مل دەنێت ! لێم پرسی: دایکە .. لێرە چی دەکەیت؟

وەڵامی دامەوە: مەترسە .. کارێك دەکەم ..

فرمێسکم بینی لەسەر ڕومەت و کوڵمە جوانەکەی دەکەوتە خوار لێم پرسی: دایکە ئەوە چیتە؟

پێی ووتم: دەی خێراکە .. بابچینە ژوور بۆ ناوەندی ئیسلامی..

وام دەزانی کە دایکم دەمارگیر و بە وەفایە بەرامبەر ئاینەکەی (مەسیحی)،

بەڵام ئەمشەو بە تەواوی پێچەوانە بوو .. سەرسام بووم کاتێك دایکم بینی سەرپۆشێکی ڕەنگاوڕەنگی لە جانتاکەی دەستی دەرهێنا و دای بەسەریدا!

چاوم تێبڕیبوو! بەهێواشی دوای کەوتبووم .. چوو بۆ ژووری ئافرەتان .. یەکێك لە خوشکان بەرەو لای دایکە جوانەکەم هات و پێشوازی لێ کرد وبڕی ووت: بەخێربێیت .. تۆ ئەو ژنەی کە دوو کاتژێر لەمەوبەر پەیوەندیت کرد؟

دایکم وەڵامی دایەوە: بەڵێ من ئەوم

"زۆر باشە .. ئێستا ئامادەیت کە شەهادە بدەیت؟

دایکم ووتی: ئەی چۆن .. بەڵێ

لە خۆشیدا دەلەرزیم و گریانم دەهات .. شانی دایکم جوڵاند و پێم ووت: دایکە .. دەبیتە موسڵمان وەك من؟ تۆ دڵنیایت لەوە؟!

ووتی: بەڵێ سارا .. وادەکەم .. وادەکەم .. هەر ئێستا.

دایکم لەبەردەمما وەستاو شەهادەی هێنا! پاشان وتی: من چەند بەختەوەرم.

پێم وت: خوای گەورە نزای ئەو خوشکانەی وەرگرت کە بۆ تۆیان دەکرد.ئەمڕۆ دایکم لەلای منەو فێری دەکەم کە چۆن بۆ یەکەمجار نوێژ بکات.. لەڕاستیدا حەز دەکات ئەم هاوینە بچێت بۆ مەکە بۆ ئەنجامدانی عەمرە ئینشائەڵلا..

تکا دەکەم نزا بۆ باوکم‌و براکەم بکەن چونکە دایکم ئەمڕۆ هەواڵی موسڵمانبوونی خۆی دەدات بەباوکم. من دەزانم کە گرانترین کاتی هەڵبژاردووە بۆ ڕاگەیاندنی موسڵمانبوونی، بەڵام لەوە زیاتر نەیتوانێ چاوەڕوان بێت! داوای تەڵاق دەکات لەباوکم ئەگەر ئیسلام وەك دین قبوڵ نەکات.

تکا دەکەم نزا بۆ منیش بکەن چونکە لەو کاتەوەی کە موسڵمانیەتی خـۆم ڕاگەیاندوە باوکم قسەم لەگەڵ ناکات، هەرچۆن بێت لە خوا دەپاڕێمەوە کـە هیدایەتی بدات بۆ ڕێگەی هەق و ئیسلام وەك چۆن منی هیدایەتدا.

# کۆچی خێر

﴿اللهم اجعل اخر كلامنا لااله الا الله و خير ايامنا يوم نلقاك فيها﴾

✓ لەسەر جێگای مردن

## من و کچی گەڕەکەکەمان

مرۆڤ سەرسام دەبێت کاتێك ڕابردووی خۆی بە بیردێتەوە، ڕابردوویەك کە تاڵ و شیرین تێکەڵ بێت ، ئەو کاتەی کە دوو ڕەوشتی دژ بەیەکی هەبوبێت ، تەمەنی منداڵیم وەك هەرکەسێکی تر پڕیەتی لە پاکێتی کاتێك یادم دەکەوێتەوە پێی دڵخۆش دەبم بەڵام چی لە تەمەنی لاوێتی بکەم کە پڕیەتی لەخەجاڵەتی و دەمهەوێت لە بیری بکەم.

لەتەمەنی پانزە ساڵیدا کەوتمە ململانێیەکی دەروونی سەختەوە کاتێك نەفسی بەدکارم هەوڵی دەدا بەرەو ڕێگای شەڕم ببات و لەهەمان کاتدا لایەتی باشەی دەروونم هانی دەدام ڕوو لە ڕێگەی چاکە بکەم ، تا ئەوە بوو ڕێگای خراپەم هەڵبژارد و بوومە پێشەنگی شەیتانەکان و باشترین مەدالیای ئەوانم بە خەڵات وەرگرت.

بە جۆرێك لەگەڵ شەیتانەکان دەستم تێکەڵ کرد کە ئیتر من لە ئەوان یاخی بووم و لێیان هەڵگەڕامەوە تا ئەوان بونە شوێن کەوتەی من و بە تەواوی کەوتمە سەر ڕێگای خراپە و خراپەکاری و لەسەرچاوە تاڵەکەیان تینویەتیم شکاند، کە سوێند بەخوا زۆر لە (علقم[2]) تاڵتر بوو.

بەمجۆرە ڕۆژێك لە رۆژان دریغیم نەکرد لە هەوڵدان بۆ لە ناوبردنی ڕەوشت وئاکاری بەرز و جوان، هەتا بومە نیشانە و هێمای گومڕایی وسەرلێشێواوان.

لەسەر پێشەنگی کردنی خراپە بەردەوام بووم تا کچێك لە کۆڵانەکەمان

---

[2] علقم: لە زمانی عەرەبیدا بە دارێکی تاڵ دەڵێن، یان هەرشتێك تاڵیەکەی زۆر بێت.

مختار الصحاح لا ٤٥٠

بووه جێگەی سەرنجم ، ئەو زۆر جار سەرنجی ئەدامیٚ بـەڵام مـن لـە واتاکـەی نەدەگەیشتم .. هەرچەندە ئەو سەرنجانە سەرنجی عەشق و خۆشەویشتی نەبوون، لەگەڵ ئەوەی من عەشق و دڵداریم نەدەزانی خاوەنی دڵ نەبوو..

ئەو سەرنجانە هۆشی منیان تێکدا بوو بەجۆرێك بوون هۆکاری لە دایك بونی بیرۆکەیەك بەڵام چۆن ؟

ئەویش دانانی داوێکی خۆشەویستی بۆ ئەو کچە، سـەرەتا کـارم بـۆ ئـەوە دەکرد کە چۆن ئەو کچە بخەمە داوەوە..

هۆنراوەیـەکم هێنـا (دەیـانوت هۆنراوەیـەکی دڵداریـە) لـە ڕێگـەی دەرگاکەیانەوە بۆم ڕەوانە کرد، بەڵام هیچ وەڵامێکم دەست نەکەوت.

ئەمە زیاتر ڕقی توند کردم و هەستی تاوانکاری تیادا جوڵانم و سوێندم خوارد کە سەری لێ بشێوێنم، پێی خۆش بێت یان نا، ئەگەر ئەو کارە قوربانی دانیشی پێویست بێت ..

هۆنراوەیەکم لەسەر کچەکە هۆنیەوە بەبیٚ ئەوەی ناوی تیادا بهێنم، بـەڵام کە هەواڵەکەی پێگەیـشت هـیچ هەڵویـستێك و بەرپـەرچ دانەوەیـەکی لـەو بارەیەوە نەبوو ..

کاتژمێر چواری بەیانی بوو تازە دەچومەوە مـاڵ، کتێبێـك لـەبـەر دەرگـای ماڵەوە دانرابوو، ناوەڕۆکەکەی بریتی بوو لە زیکرو ئەو نزایانەی کە پێغەمبەری خۆشەویست (صلى الله عليه وسلم) خوێندبووی.

کە زانیم ئەو کـچە بـۆی نـاردووم زۆر تـوڕە بـووم ، دەموچـاوم سـوور هەڵگەڕا، دەماری شەڕەنگێزیم تەواو جوڵا و بڕیارمدا کە هەموو تواناکانی خۆم بخەمە گەڕ لەدژی ئەو.

چونکە ئەمە کارە ڕاگەیاندنی شەڕ بوو لە لایەن ئەوەوە.. بیرم لەوە کردەوە کە ئابڕووی بەرم ئەمەش بە دروستکردنی چیرۆکێکی خۆشەویستی کە لەنێوانماندا ڕوویداوە و پاشان بیکەمە هۆنراوەیەك و لەناو گەڕەکدا بڵاوی بکەمەوە.

چاوەڕێی کۆمەك و یارمەتی شەیتانەکانم کرد بۆ ئەو کارە نەشیاوە "نوسینی هۆنراوەکە"، بە تەواوی بونی پیلانەکەم یەکسەر بۆم نارد و هەڕەشەی ئەوەم پێ گەیاند کە ئەمە لای هەموو ناسیاو ئاشناکانی بڵاو دەکەمەوە .

چاوەڕێی ئەنجامی کارەکەم بووم ، بەڵام ئەوەی بەبیرمدا نەهاتبوو ڕوویدا کاتێك خزمەتکارەکەم هاتەوە چەند دەنکەخورمایەکی پێ بوو، پێی ڕاگەیاندم: کە ئەو چەند دەنکە خورمایە دیاری ئەو کچەیە لە جیاتی ئەو هۆنراوەیەی کە بۆت ناردووە.

هەروەها ووتبوی: لەبەر ئەوەی کاتی بەربانگ نزیکە و ئێستا بەڕۆژووم ، کاتێك ڕۆژووم شکاند نزای بۆ دەکەم کە خوا هیدایەتی بدات.

دەنکە خورماکانم لێ وەرگرت و فڕێمدایە سەر زەوی، چاوم ئەوەندەی تر سوور هەڵگەڕا و شەڕیان لێ دەباری.. پەیمانمدا کە زوو یان درەنگ تۆڵەی خۆمی لێ بکەمەوە و ئەگەر زیندوو بمێنم گومڕای بکەم و نەهێڵم لەسەر ڕێگای چاکە وخەیر بمێنێتەوە .

گیانی تۆڵە سەندنەوەم گەشەی کرد بۆ ئەوەش بەدوای کاتێکی گونجاودا دەگەڕام و بەردەوام لە کەمین دا بووم و دەچوومە سەرەڕێی.

ئەو کاتانەی دەچووە مزگەوت و دەگەڕایەوە بەردەوام تانە و توانجم لێدەدا بەجۆرێك ئەو کچانەی کە لە گەڵیدا بوون پێی پێدەکەنین، بەڵام ئەم کارەم نەبووە دروست بوونی هیچ بەرپەرچدانەوەیەك تیایدا .. نایشارمەوە وەك شاخ

كە باو زریان ناتوانی زەفەری پێ ببات خۆڕاگر بوو و بەبــەردەوامی جـێگیر و دامەزراوو بوو..

بە تێپەڕ بوونی كات هــەموو هەوڵــەكانم بــەفیڕۆ چــوو، نــەمتوانی ئــەوەی دەمەوێ جێ بەجێ ی بكەم و ئەو كچە وەك خۆم گـومرا بكـەم ، بــەڵام ئــەو هەموو دووشەممە و پێنج شەممەیەك بەڕۆژوو دەبوو ، بەناردنی نامیلكە و خورما وەڵامی منی دەدایەوە، بەزمانی حاڵ پێی دەووتم كە من سەركەوتوو بووم، ئەو بڕوای تەواوی بەخۆی هەبوو ئەمەش لە هەڵسوكەوتیدا دیاربوو .

بەمەبەستی دەست كەوتنی لـەزەت و خۆشی زیاتری دونیا بڕیارمدا گەشتێك بكەم بۆ دەرەوەی وولات ، بەرەو ولاتێك بچم كە بەرەڵلایی و سەرگەردانی لێ یە، بچم بۆ ولاتێك كە ئەو كارە حەرامانەی ئارەزووی دەكەم تیادا ئاوەڵایە و لـە ولاتەكەی خۆم بە ئاسانی دەستم ناكەوێت، بۆ ماوەی چوار مانگ ڕۆیــشتم بەڵام لـەوێش هەر بیرم لای ئەو كچە بوو ، چۆن ئەو توانی هەموو نەخشەكانی من لـەبارببات و سەركەوتوو بێت بەسەرمدا، زیاتر سوور بوو لـەسەر دەستگرتن بە ئاینەكەیەوە و بەردەوام منیشی بانگهێشت دەكرد بۆ دینداری و هەوڵی دەدا لـەسەر ئەو ڕێچكەیەی كە گرتومەتە بەر لامبدات .

كاتی گەڕانەوە بۆ نیشتمان هاتە بەرەوە، بڕیارمدا بە گەیشتنەوەم شێوازێكی نوێ پەیڕەو بكەم .. دەبێت لـە دینەكەی پەشـیمانی بكەمــەوە و بیخەمــە ســەر ڕێگەی بەرەڵایی و خراپەكاری بۆ ئەمەش نەخشەیەكی ناشیرین و پڕ فێڵم دانا.

لـەكاتی گەشتەكەمدا خزمەتكاری فڕۆكەكە قاوە و خورمای بۆ هێنام ئەمەش خورمای كچەكەی بیرهێنامەوە كە بۆی دەناردم بۆیە بەمە توڕە بووم و تــەنها قاوەكەم خواردەوە و خورماكەم فڕێدا كە نیشانەی ڕۆژوەوانان بوو و بەردەوام

ئەو کچەی بیر دەخستمەوە .

ئەو ڕۆژەی گەیشتمەوە پێنج شەممە بوو ، ئەمە ئەو ڕۆژیە کە ئەو تیایدا بەڕۆژووە، لە فڕۆکەخانەی ئەو شارەی تیایدا نیشتەجێم دابەزیم ، کاتژمێر یەکی نیوەڕۆ بوو بە سواری تەکسیەك چوومە ماڵەوە، هاوڕێکانم بۆ بەخێرهاتنەوە سەردانیان کردم ، ئەوان چاوەڕوانی دیاریەکانیان بوون منیش هیچیانم نائومێد نەکرد، هەریەکە دیاریەکی قێزەونم پێدان چونکە هەمویان ئەهلی خراپە بوون ، بەڵام دیاریەکی گرانم بە تایبەت هێنابوو کە لە هەمویان قێزەونتر بوو دامنابوو ڕەوانەی بکەم بۆ ئەو کچە تابزانم چی لێدەکات.

نزیکی بانگی ئێوارە هاتمە سەر ڕێگای کچەکە چونکە ئەو بەردەوام نوێژی بە کۆمەڵ و لەمزگەوت دەکرد ، مزگەوتەکەش قوتابخانەیەك و پەیمانگایەکی تێدا بوو تایبەت بە ئافرەتان بۆ لەبەر کردنی قورئانی پیرۆز، کاتی نوێژ هات و بانگ درا .. کاتی قامەت هات و نوێژ کرا بەڵام ئەو دیار نەبوو، زۆر سەیر بووم لام چونکە ئەمە خوی ئەو نەبوو ، لەدڵی خۆمدا ووتم:تۆ بڵێی لەکاتی گەشتەکەی مندا گۆڕانی بەسەردا هاتبێت و وازی لە مزگەوت و دینداری هێنابێت، ئەمە دەچێتە عەقڵەوە!

بە ئومێدی ئەوەی بۆچونەکانم ڕاست بێت بەرەو ماڵ گەڕامەوە ، سەرقاڵی کتێبەکانم بووم قورئانێکم لەناویاندا بینی کە لەسەری نوسرابوو ئەمە پێشکەشە بە تۆ بەڵکو خوای گەورە ڕێنموییت بکات و بتخاتە سەر ڕێگەی ڕاست، ئیمزا/ ناوی کچەکە

لە خۆمم دورخستەوە و هاوارم لە خزمەتکارەکەم کرد ئەوکاتەی من لێرە نەبووم کێ ئەم قورئانەی هێناوە؟ وەڵامی نەدامەوە.

بۆ ڕۆژی دووەم چومەوە نزیك دەرگای مزگەوت و چاوەڕوانی هاتنی

کچەکەم دەکرد .. قورئانەکەشم بە دەستەوە گرتبوو دەمویست بیدەمەوە و پێی بڵێم کە پێویستیم پێی نی یە، هەروەها دەمویست ئەوەی پێ بڵێم کە من سوورم لەسەر ئەوەی بەم نزیکانە تۆش دوربخەمەوە لێ ی هەتا وەك من و زۆر لە لاوانی ئەم رۆژگارەت لێ بێت..

چاوەڕوان بووم هەر نەهات ..

ئەمەم چەند رۆژێك دوبارە کردەوە بەڵام سوود بوو ، چومە نزیكماڵیان چەند منداڵێك لەگەڵ براکانی ئەو کچە یاریان دەکرد، پرسیارم لە منداڵێکیان کرد: فلان کەس لەوێیە؟

پێیان ووتم: سەیرە، ئەم پرسیارە بۆ دەکەیت؟ دیارە تۆ خەڵکی ئەم گەڕەکە نیت؟

ووتم: با بەڵام نامەیەکم بۆهێناوە لە هاوەڵێکی خۆیەوە دەمەوێ بچن بۆ بۆی بەرن ..

پێیان ووتم:

ئەو کەسەی کە تۆ پرسیاری لەبارەوە دەکەیت ئەوە زیاد لە دوو مانگە گەڕاوەتەوە بۆ لای خوا، ئەو لە نوێژدا و لە مزگەوت لەکاتێکدا سوجدەی برد بوو رۆحی سپارد، لەوکاتەدا نازانم چیم بەسەر هات دونیا لەبەرچاوم دەسوڕا ئەوەندەی نەما بوو بکەوم، قاچەکانم نەیاندەتوانی جەستەم هەڵگرن.

خۆم بۆ نەگیرا و دەستم بە گریان کرد، هەرگیز نەمزانیبوو گریان چییە مەگەر لە منداڵیدا و تەنها لەو کاتانەدا کە برسیم دەبوو، هەستم بە نیانی و

بەزەییەك كرد لـە دڵمدا، دەروونم هەژا بۆ ئەم كچە هەژارە .. بـەڵكو سـوێند بەخوا ئەو كاتە زانیم كە من هەژارم ..

پرسیارم لــە خــۆم كـرد ئـەم گریانـە بۆچـی؟ ئایـا لـەبـەر مـردن و كۆچـە بەخێرەكەیەتی ؟ یان لـەبەر شتێكی ترە كە من نایزانم ؟

دەبی ڕاشكاوانە ئەوە بدركێنم بیستنی ئـەو هەواڵــە و بـەو كوتوپڕیـە زۆر سەخت بوو لـەبەر ئەوە هیچ توانای لێكدانەوەم نەبوو.

هەروەها هیچ هۆ و تەفسیرێكم بۆ ئەو خەمباریە نەبوو، بەپی بەرەو ماڵبەرێ كەوتم لـەكاتێكـدا خەمباریـەكی زۆر بـە دەموچـاومەوە دیـاربوو نەمـدەزانی چ ئاراستەیەك بگرمە بەرو بۆ كوێ بڕۆم؟

بیستنی هەواڵی كۆچی دوایـی ئـەو كـچە تووشـی شـۆكی كـردم كاتێـك گەیشتمە ماڵ لـە دەرگامدا ..هۆشی ئـەوەم نـەبوو كلیلـەكـە لــە گیرفانمدایـە، هەموو شتێكم بیر چوبۆوە .. بیرم چو بۆوە من كێم ..

ئەوەم هاتەوە یاد كە چۆن سـەرنجەكانی ئـەو كـچە بـەردەوام و لـەهـەموو شوێنێكدا بە دوامەوە بوون ، بەڵام من هەڵە تێگەیشتبووم وامدەزانی مەبەسـتی خراپەیە، بەڵام لـە ڕاستیدا ئەوانە سەرنجی سۆز و بەزەیی بوون بەرامبەر كەسێك كە ژیانی لـە گومراییدایە، ئەو هیوای دەخواست و نزای بۆ دەكـردم كـە لــە خراپە دوركەومەوە.

سەرەنجام نزاكانی شوێنی خۆیان گـرت چـونكە بڕیارمـدا كـە بـچم بـەدەم بانگەوازەكەیەوە و ئەو خواستانە جێ بەجێ بكەم كە لـەبەر من و بۆ من بوون .. بڕیارمدا ..

ئەوە بۆ ساڵێك زیاترە من مرۆڤێكی ترم، ئێستا لـە كەسـوكار و لــە خـەڵك دوركەوتومەتەوە لـە شوێنێكی دوور لـەو گەڕەكە نیشتەجێم ، بەردەوام هەست

دەکەم کە چاودێریم دەکات و لێم جیا نابێـەوە، هـەردەم شـێوەیم لـەبەرچـاوە چۆن دەچوو بۆ مزگەوت و چۆن دەگەڕایەوە.

زۆر لـە هاوەڵەکانم هەوڵی ئەوەیاندا کە هـۆی دورکەوتنـەوەم بـزانن لــە کۆمەڵگا و دابڕانم لـە دونیا.. هۆی هەڵبژرادنی ژیانی تەنهایی، بەڵام بی سسود بووە و هەرگیز هۆکەیم پێ نەوتون، سەبارەت بە ئەوان ئەمە بە نهێنی دەمێنێتەوە هەتا هەتایە.

ئەو قورئانەی کە دیاری ئـەو بـوو بـۆ منـی نـارد بـەردەوام لـەگەڵمدایـە، هەرچەندە ماچی بکەم دەگریم .. ئەوەم بیردەکەوێتەوە چۆن ئەو هیدایەتی بـۆ من نارد و منیش خراپەم لـەگەڵ کرد .

لـەیەکەم هەنگاوی بەرەو خوا چونمدا کاتێك دەستنوێژم گرت و ویستم نوێژ بکەم خۆم بە پێوە بۆ نەگیرا و کـەوتم هەرچـەندە هـەوڵی هەسـتانەوەم بدایـە ئەکەوتمەوە .. چونکە من لـە نوێژکەران نەبووم، بەدرێژایی ژیـانم یـەك رکـات نوێژم نەکرد بوو، بەردەوام بووم لـە هەوڵدان.. هەتا خوای گەورە یارمەتی دام و ناوی پەروەردگارم هێنا و شایەت وئیمانم هێنا.

گریام و لـە خوا پاڕامەوە کە لـەنەفسی بەدکارم ببورێ و لـە هـەمان کاتـدا بەزەیی فراوانی خۆی بەسەر ئەو کچەدا بڕێژێ ، ئـەو کـچەی کـە بـەردەوام هەوڵی دەدا بەرەو چاکەم ببات بەڵام بە پێـچەوانەوە مـن هـەوڵـم دەدا بـەرەو خراپەی بەرم، هیوام دەخواست کە نەمردایە هەتا منی بدیایـە لـەسـەر ڕێگـەی ڕاست کە زۆر ئارەزووی دەکرد.

بەڵام هەر شتێك کە ویستی خوای لـەسەر بوو دەبێت ببێت، هـیچ هێزێـك

نییە ڕەتی بکاتەوە، بۆ ساتێکیش ئەوم لە بیرناچێت و لەناخی دڵەوە لای خوا نزای بۆ دەکەم.. لە کاتی نوێژ و لەدوای نوێژ هەردەم نزا دەکەم کە خـوای گەورە ڕەحمی پێ بکات، لەسایەی بەزەیی خۆیدا لەگەڵ ئەودا پێکەوە و لەگەڵ بەندە چاکەکانی کۆم بکاتەوە و لەگەڵ ئەوان حەشرم بکات ..

خوا ڕەحمی پێ بکات بە بەهەشتی فراوانی خۆی شادی بکات .. ئامین ..

# کچێك پلەی خۆی لە بەهەشتدا دیاریکرد

ئەو لە کاتێکدا قسەی دەکرد فرمێسك بەری چاوانی گرتبوو، گریان بەری قورگی گرتبو هەندێ جار قوتی دەدایەوە و هەندێك جار توانای بەسەریدا نەدەما و دەستی بە گریان دەکرد .. بەو جۆرە باسی هاوڕێکەی خۆی بۆ کردم:

هەر لەو کاتەوەی بینیبوم خۆشەویستی چوو بووە دڵمەوە .. زەردەخەنە شیرینەکانی .. ووشە ناسکەکانی .. ڕۆشنایی ئیمان لە دەموچاویدا ڕەنگی دەدایەوە .. ڕوونی و پاکیەکەی .. هەموو شتێکی ئەو وای لێکردم بیکەمە هاوڕێیەکی خۆشەویستی خۆم..

کاتێك خەمەکانم بۆ ئەو هەڵدەڕێژم ئەو دڵنەواییم دەکات .. سکاڵای لاوازی ئیمانم بۆ ئەو دەبەم و ئەویش ئامۆژگاریم دەکات و فێرم دەکات.

زۆر سەرنجی دەدەم ئەو بەردەوام ئەو ئایەتانە دەخوێنێتەوە کە لەبەریەتی، لە بەرامبەریدا هەست بە کەمی و لاوازی خۆم دەکەم .. هەموو گوێی لێ دەگرن ، هەموو خۆشیان دەوێت، ئەو مەشخەڵی هیدایەت بوو بۆ هەموان.

توانی پشتی بکاتە دونیا ونەهێڵێ فیتنەکانی ئەم ڕۆژگارە سەرقاڵی بکات،لە ئەهلی قیامەت دەچوو، مۆدە و مۆدێلە تازەکان لای ئەو هیچ نرخی نەبوو..

ئەو سادە بوو لە جلوبەرگ وخواردن و خواردنەوەدا، ووشە و ووتەکانی یادی خوا و خوێندنی قورئان بوو، فەرمان بوو بەچاکە و بەرگری بوو لە خراپە، ووشەکانی جۆرێك بوون دڵەکانی ئارام دەکردەوە .

ئیمانداران بەپێی ئاستی ئیمانیان دەکەونە بەر تاقیکردنەوەی پەروەردگار، ئەویش توشی تاقیکردنەوەیەك هات کە نەخۆشیەکی مەترسیدار بوو، هەر زوو

بە زوو بەناو خانەکانی لەشیدا بلاوبۆوە و زاڵ بەسەریا، بەڕاستی پێیان ووت کە نەخۆشیەکەی شێرپەنجەیە .

پێغەمبەری خۆشەویست (صلی الله علیه وسلم) فەرمویەتی:

"أشد الناس بلاء الانبياء ثم الامثل فالامثل يبتلى الناس على قدر دينهم، فمن ثخن دينه اشتد بلاؤه ومن ضعف دينه ضعف بلاؤه، وان الرجل ليصيبه البلاء حتى يمشي في الناس ما عليه خطيئة" رواه ابن حبان وهو حديث حسن

بەو جۆرە ناڕەحەتیەکان دەبنە هۆی پاك بونەوەی مرۆڤەکان لە تاوان و گوناه، چونکە گەورەیی پاداشت لەگەڵ گەورەیی ناڕەحەتیەکانە، ئەگەر خوای گەورە کۆمەڵێکی خۆشەویست تاقیان دەکاتەوە هەرکەس ڕازی بوو ئەوە بەر ڕەزامەندی خوا دەکەوێت و هەرکەس بێزاری دەبڕی ئەوە توڕەیی بەشیەتی ..

پێغەمبەری خۆشەویست (صلی الله علیه وسلم) فەرمووی"بەردەوام بەلا و ناڕەحەتی تووشی موسڵمان دەبێت، خۆی و ماڵ و منالّی هەتا دەگاتەوە لای خوای گەورە هیچ گوناهێکی پێوە نەماوە"[3]

اللهم اني اعوذ بك من جهد البلاء و درك الشقاء و سوء القضاء و شماتة الاعداء.

بەم جۆرە تەندروستی هاوڕێ قورئان لەبەرەکەم رۆژ لە دوای رۆژ خراپتر دەبوو ، بەڵام ئەم نەخۆشیە نەیدا لە دڵی و هەر بە زیندویتی مایەوە و تێکی نەشکاند، ئەو بەردەوام دڵی پڕبوو لە ئیمان و باوەڕ .. ئارامگر بوو و چاوەڕوانی پاداشتی خوا دەکرد، ڕازی بوو بە قەزای خوا، زمانی پاراو بوو بە

[3] "مايزال البلاء بالمؤمن والمؤمنة في نفسه و ولده وماله حتى يلقى الله تعالى و ماعليه خطيئة" رواه الترمذي و قال حديث حسن صحيح.

یادی خوا ، ئەو كە ئایەتەكانی قورئانی دەخوێندەوە ئارامی و فێنكی و دڵنەوایی خۆی تیادا دەبینیەوە .. چۆن نابێت لە كاتێكدا ئەو ووشە پیرۆزەكانی خـوای گەورەی دەخوێندەوە.

كاتی یەكلایی كردنەوە هات، كاتی گیان كێشان و غەرغەرەی مردن، كاتی هەناسەبڕكێ و ئازار هات "خوا پەنامان بدات"، ئەو بەردەوام چەند ووشەیەكی دەوتـەوە ئەوانـەی لـە دەوری بـوون لێ ی تێنەدەگەیـشتن، لـەو كاتـەدا زەردەخەنەی دەكرد و دەموچاوی وەك پەڕەی قورئان ڕوناك بوو .

دەیوت.. نەخێر .. پلەی بەرزترم دەوێت .. نا ..پلەی بەرزترم دەوێت

كەسوكارەكەی لە قسەكانی سەرسام بـوون دەیـانووت : ئـەوە "تـا"یـە .. غەرغەرەی مردنە .. بێگومان ئەو وڕێنە دەكات .

ئەویش بەردەوام دەیوتەوە .. نا ..پلەی بـەرزترم دەوێـت .. لـە كۆتاییـدا زەردەخەنەیەكی گەورەی كرد و پاشان جەستەی بە تەواوی ئارام بۆوە، دوای ئەوە ڕۆحی پاكی بەرز بۆوە بۆ لای پەروەردگار .. ئەو مرد دوای ئەوەی پلەی خۆی لە بەهەشتدا دیاری كرد ..

داواكارم لە خوای گەورە كە هـاوڕێ ئیمانداره‌كـەم لـە بەهەشـتدا بخاتـە فیردەوسی باڵاوە، هاوڕێ خۆشەویستەكەم كە قورئانی پیرۆزی لە سنگدا بـوو بەئارامگریـەوە مـرد، ئـەوێك كـە بـانگخواز بـوو بـۆ لای ئیمـان، خـەمخۆری نوێژەكانی بوو، بەردەوام بوو لەسەر بەندایەتی، دونیا بە شـەهوەت و چـێژ و خۆشیەكانیەوە هەڵی نەخەڵەتاند .. وەك چۆن قورئانی پاراست لە سنگیدا بەو جۆرە خوای گەورە پاراستی .. هەروەك چۆن كاری دەكـرد بـە فەرمانـەكانی خوای گەورە بەو جۆرەش بەرگری لە خراپەكان دەكرد ..

خۆشەویستان ئەم چیرۆکە ڕوداوێکی ڕاستەقینەیە و شێخ (علی باقیس) باسی کردووە و لە چەند کاتژێرێکی کەمدا نوسیویەتی.

داوا دەکەین لە خوای باڵادەست ڕەحم بکات بەم کچە و کۆتایی ئێمە و سەرجەم موسڵمانان بە چاکە بگێڕێ .. ئامین.

## لە شەوی بوکێنیدا

بەو جۆرەی بڵاوکـەرەوەی ئـەم چـیرۆکە بـۆی باسـکردین ئـەم ڕووداوە ڕاستەقینەیە و ئەندێشە نیە، پێشکەشە بەو کەسانەی کـە خـاوەنی دڵـن یـان گوێدەگرن[٤] بۆ ئەوەی پەندی لێ وەرگرن، ئەو کەسانەش کـە خـاوەن ژیـرین سوودی لێ وەرگرن و لە خاوەنی چیرۆکەکە پەندێك فێربن.

خـاوەنی چـیرۆکەکەمان کـچێکی بـڕوادار و ڕاسـتگۆیە لەگـەڵ خـوای پەروەردگار .. ئەمەش چیرۆکەکەیەتی:

ئاهـەنگی گواسـتنەوەیە، ئەمـشەو ئاهـەنگی گواسـتنەوەی بوکـە، هـەموو پێداویستیەکان ئامادەن، ئەوانەی دەوروپشتی هەموو بەیەکەوە گرنگیان پێدەدا..

دایکی و خوشکەکانی و هەموو نزیکەکانی پێکەوە چاوەڕوانی ئـەو کەسـە بوون کە دێت و بووك ئارایشت دەکات و ڕێکی دەخـات، بڕیـار بـوو دوای عەسر بێت ، بەڵام دواکەوت و کاتیش بەخێرایی تێپەڕ دەبوو، هەرچـۆن بـوو هات و دەستی بەکارەکانی کرد، بەردەوام بوو هەتا نزیکی بانگی ئێوارە .

بوك داوای کرد کە پەلە بکەن و بەر لـە بانگی ئێوارەکارەکە تەواو بکەن .. چونکە ئەو هەر لـە منداڵیەوە وا ڕاهاتوە کە نوێژ لەکاتی خۆیـدا دوانـەخات، ساتەکان تێپەڕ دەبوون .. لـە ناکاو دەنگی هەق و ڕاستی بەرز بۆوە .. الله اکبر .. الله اکبر .. ئەوە بـانگی ئێوارەیـە .. شـڵەژاوی و بێتاقـەتی بـە دەموچـاوی بوکەخانەوە دیار بوو، بەڵکو خەمبار بووچونکە دەیویست نوێژەکەی بکات، لـەبەر ئەوە ووتی: تکا دەکەم خێرا بکەیت، کاتی نوێـژی ئێـوارە کورتـە، لــە

[٤] {إِنَّ فِي ذَلِكَ لَذِكْرَى لِمَن كَانَ لَهُ قَلْبٌ أَوْ أَلْقَى السَّمْعَ وَهُوَ شَهِيدٌ }ق٣٧

وەڵامدا ئەو ژنەی ئارایشتی بۆ دەکرد پیی ووت: پێویستمان بە کاتی زیاترە تکا دەکەم کەمێك ئارام بگری چونکە ئەمشەو تۆ بوکیت، چی دەبێت ئەگەر تۆزێك دوابکەویت.

کات تێپەڕ دەبوو و نزیك بوو لەوەی نویژی ئێوارە نەمێنێ، بوکەخانیش سوور بوو لەسەر نوێژ کردن، هەموو لە هەوڵی ئەوەدا بوون ئارامی بکەنەوە هەتا ئارایشتەکەی تەواو دەبێت .

پێیان دەووت: ئەگەر دەستنوێژ بگریت کاری ئەم چەند کاتژێرەی کە کراوە هەمووی لەناوی دەبەیت.

بۆ ئەوەی قەناعەتی پێ بکەن نوێژەکەی دوابخات یان نەیکات لەملاولاوە فەتوای جۆراو جۆری بۆ دەهات، پێیان دەوت نوێژی ئێوارە لەگەڵ نوێژی خەوتناندا کۆبکەرەوە، یان پێیان دەووت تەیەموم بکە . بوکی ئیماندار بۆ دواجار سوور بوو لەسەر هەڵوێستی خۆی، بڕیاری خۆیدا و پشتیوانی بەخوا بەست، وازی لەو قسە و فەتوایانە هێنا و کاری پێنەکردن ..چونکە ئەوەی لە لای خوایە باشترە و بەردەوام ترە.

بەم جۆرە بە هەستێکی ئیماندارانەی ڕاستەقینەوە هەستاو دەست نوێژی گرت.. بەرماڵی نوێژی ڕاخست .. لە ڕوخساریدا ئارامی و هێمنی دەردەکەوت بە چەند قاتی ئەو کاتەی کە لەبەردەست ئارایشتکەرەکەدا دانیشتبوو، بەختەوەری ئەو لەکاتی نوێژەکەیدا دەردەکەوت بە بەراوورد لەو ساتەی کە بۆ ڕازاندنەوە دانیشتبوو و چاوەڕوان بوو بیکەنە بووك بۆ هاوسەرەکەی .

الله اکبر .. بەڵێ خوا گەوریە لە هەموو شتێك .. لە هەموو فەرمانێك .. ئەوە بوك دەگاتە ڕکاتی سێهەم و لە تەحیاتی کۆتایی نوێژدایە ..

کەسوکارەکەی بە دەوریدا سەرنجی سەیری دەدەنێ، سەرنجی پڕ لە توانج، لەگەڵ ئەوەی بە ئارەزوویەکی زۆرەوە چاوەڕوانن لە نوێژ بێتەوە هەتا بگەڕێتەوە شوێنی خۆی.

هەر ئەوەندەی سەلامی لای ڕاستی دایەوە و پاشان سەڵامی لای چەپی دایەوە ڕۆحی لە شەقەی باڵیدا و گەیشتەوە لای پەروەردگار .. ئەم دونیایەی بەجێهێشت بە گوێڕایەڵی کردنی خوای پەروەردگار و ملکەچ نەکردن بۆ شەیتان .

داواکارین لە پەروەردگار لەوانە بێت کە بەرەو بەهەشت بەڕێ دەکرێن لە کاتێکدا نیشتەجێ بوانی هیچ نارەحەتیەك نابینن .

تەواو بە حەمدی خوا

## قورئان خوێن

ئاسایی ئوتومبێلەکەی دەئاژوو، ئاراستەی بەرەو شار بوو، ڕێگاکە چەند تونێلی تیادا بوو لەناو یەکێك لەو تونێلانە ئوتومبێلەکەی لەکارکەوت بۆ چاکردنی ناتەواوی یەکێك لە تایەکان لە ئوتومبێلەکەی هاتەخوار، کاتێ لە دوای ئوتومبێلەکەیەوە وەستا بۆ داگرتنی تایە ساغەکە، کوتوپڕ ئوتومبیلێك بە خێراییەکی زۆر هات و لە دواوە خۆی پێداکێشا .. لاوەکەی بە بەبرینداری خستە سەر زەوی.

یەکێك لەو کرێکارانەی کە چاودێری ڕێگاویان دەکەن بەم جۆرەی چیرۆکەکەی گێڕایەوە:

من و هاوڕێکەم هاتین و بەیەکەوە لاوە بریندارەکەمان هەڵ گرت و خستمانە ناو ئوتومبێلەکەوە و پەیوەندیمان کرد بە نەخۆشخانەوە بۆ پێشوازی کردن لە لاوێك کە لەسەرەتای تەمەنیدایە.

ڕوخساری لە کەسێکی ئیماندار دەچوو، کاتێك هەڵمانگرت گوێمان لێبوو ونگە ونگی دەکرد، لەبەر پەلەکردنمان نەمانزانی چی دەڵێت وهیچی لێ تێ نەگەیشتین، بەڵام کاتێك خستمانە ئوتومبێلەکەوەو کەوتینە ڕۆیشتن .. گوێمان لە دەنگێکی ئاشکرا بوو کە بە هێواشی قورئانی دەخوێند.. سبحان الله نالێی ئەمە بریندارە (تۆ بلێی ئەمە دەنگی ئەم بریندارە بێت) .. خوێن جلەکانی داپۆشیوە و ئێسقانەکانی شکاوە، بەڵکو ئەو لەسەر لێواری مەرگە ..

ئەو بەردەوام بە دەنگێکی هێواش و جوان قورئانی دەخوێند .. قورئانی بە تەرتیلەوە دەخوێند، لە ژیانمدا بەو شێوەیە سەرنج ڕاکێشە گوێم لە قورئان نەبووە .. هەستم بە ڕاچڵەکینێك کرد کە بەناو لەشم و پەراسووەکانمدا گوزەری دەکرد، دەنگەکە نەما، ئاوڕم دایەوە بۆ دواوە پەنجەی شەهادەی بەرز

کردبۆوە و شایەتمانی دەدا.. پاشان سەری نەوی بوو بازم دایە دواوە دەستیم گرت .. دڵیم پشکنی .. هەناسەی هیچ نەما بوو دونیای بەجێ هێشتبوو ..

زۆرم تێڕوانی ،خۆم بۆ نەگیرا بە هێمنی دەستم بە گریان کرد بەلاّم نەمهێشت هاوەڵەکەم بزانێت، بەهێواشی پێم ووت کە لاوەکە مردووە بەلاّم ئەویش خۆی بۆ نەگیرا و دەستی بە گریان کرد ، ئیتر بە ئاشکرا دامە پڕمەی گریان و فرمێسکەکانم جۆگەلەیان بەست.

دیمەنی ناو ئوتومبێلەکە زۆر کاریگەر بوو، کاتێك گەیشتینە نەخۆشخانە چیرۆکی ئەم لاوەمان بۆ ئەوانە دەگێڕایەوە کە لەوێ بوون، زۆریان بەو ڕوداوە و وەفات کردنی ئەو لاوە نیگەران بون، وەك ئێمە ئەوانیش دەستیان بە گریان کرد، ڕوومەتیان فرمێسکی تەڕ بو بو، یەکێك لەوانە بە بیستنی چیرۆکەکە چوو ناوچەوانی لاوەکەی ماچ کرد .. هەموو سور بون لەسەر ئەوەی کە نەڕۆن و چاوەڕوان بن بۆ ئەوەی بەشداربن لە نوێژ کردن لەسەری ..

فەرمانبەرێکی نەخۆشخانە پەیوەندی کرد بەماڵی لاوەکەوە، کاتێك برای لاوەکە هات باسی لە ژیانی کرد:

هەموو ڕۆژانێکی دووشەممە دەچوو بۆ سەردانی داپیرەی کە بە تەنها لە دێیەك دەژی، سەرباری ئەوەی کە سەردانی بێوەژن و هەیتوان و هەژارانی دەکرد، لای دانیشتوانی دێیەکە ناسراو بوو چونکە لەگەڵ خۆیدا کتێب و کاسێتی ئاینی بۆ دەبر و دابەشی دەکرد بەسەریاندا.

لە هەموو چونێکدا ئوتومبێلەکەی پڕ دەکرد لە برنج و شەکر بەمەبەستی دابەش کردنی بەسەر هەژاران و بێ نەواياندا.

کڕینی شیرینی بۆ مناڵان و دڵخۆش کردنیان بەشێك بوو لە ئەو ئیشانەی

لەسەردانەکەیدا دەیکرد.

کاتێك باسی دووری ڕێگا و نارەحەتی ئەو سەفەرەیان بۆ بکردایە دەیووت زۆرترین سوودم لە دوری ڕێگاکە وەرگرتووە چونکە قورئانی تیادا لەبەر دەکەم و بەسەریدا دەچمەوە ، لەگەڵ خۆمدا کاسێت دەبەم و گوێ لە ئامۆژگاری و وانەی ئاینی دەگرم ، ئەمە جگە لەوەی لە هەنگاوەکانمدا کۆمەڵێك پاداشتم هەیە.

بەیانی ڕۆژی دوایی مزگەوت پڕ بوو لە نوێژکەران، لەگەڵ کۆمەڵێکی زۆر لە موسڵمانان نوێژمان لەسەر کرد، پاشان هەڵمان گرت و بردمان بۆ سەر قەبران، کردمانە ئەو چاڵە تەسکەوە.

ئیتر ئەو پێشوازی لە یەکەم ڕۆژی دوایی کرد .. وەك ئەوە بوو منیش پێشوازی لە یەکەم ڕۆژی دونیا بکەم.

﴿ الزمن القادم عبدالملك القاسم﴾

## گەنجێكی لاسار

ئەم چیرۆكە لە بازاڕەكانی "عەویس" لە "ڕیاز" ڕویداوە، یەكێك لە پیاوچاكان دەڵێت: بە ئوتومبێلەكەم بە بازاڕدا دەڕۆیشتم، كچ و كوڕێكی هەرزەكارم بەیەكەوە بینی، دوو دڵ بووم لەوەی كە دابەزم و ئامۆژگاریان بكەم ؟ بەڵام لە كۆتاییدا بڕیارمدا ئامۆژگاریان بكەم.

هەركە ئوتومبێلەكەم ڕاگرت و دابەزیم كچەكە ڕایكرد و لاوەكەش ترسی لێ نیشت چونكە وایدەزانی من لە دەستەی فەرمان بە چاكە و بەرگری لە خراپەم.

كە لێی نزیك بومەوە شلەژابوو، سەلامم لێكرد و پێم ووت : من لە دەستە نیم و پۆلیسیش نیم، بەڵكو برایەكی تۆم و حەز دەكەم توشی خێر بیت لەبەر ئەوە بە باشم زانی ئامۆژگاریت بكەم.

پاشان پێكەوە دانیشتین و باسی گەورەیی خوام بۆ كرد،سەرنجمدا چاوەكانی فرمێسكیان دەباراند، دوای ئەوە لەیەكتر جیابوینەوە و بەڵام ژمارەی تەلەفونەكانمان بەیەكتردا.

دوو هەفتە دوای ئەوە ڕوداوە ڕۆژێك گیرفانەكانم دەگەڕام ژمارەی تەلەفونی ئەو لاوەم هاتەوە بەر دەست بە خۆمم ووت بۆ پەیوەندی پێوەنەكەم، بزانم چی كردووە؟

ئەو كاتەی تەلەفونم بۆ كرد بەیانی بوو سەلامم لێكرد ووتم:

من فلان كەسم دەمناسیتەوە ..؟

پێی ووتم :چۆن ئەو دەنگە ناناسمەوە كە ڕۆشنایی هیدایەتی لێوە دەركەوت و ڕێگای ڕاستم پێ بینی.

بڕیارمان لەسەر دانانی کاتێکدا کە یەکتری تیادا ببینین کە دوای عەسری هەمان ڕۆژی دەکرد.

ویستی خوای گەورە وابوو میوانم هات و توانای مۆڵەت وەرگرتنم نەبوو لێیان، بۆماوەی کاتژێرێك دواکەوتم پاشان کەوتمە گومانەوە بچم یان نا.

ووتم: بەڵێنەکەم بەسەر بەرم باشترە ئەگەر درەنگیش بێت.

کاتێك لە دەرگامدا باوکی دەرگاکەی کردەوە :

سەلامو عەلەیکوم ..

وە عەلەیکوم و سەلام..

پرسیاری هاوەڵەکەم کرد : لەماڵەوەیە

باوکەکەی بەسەرسامیەکی زۆرەوە سەیری دەکردم ..

ووتم: فلان لەوێیە؟

بەڵام ئەو هەر بە سەرسامیەوە سەرنجی دەدامێ .. پاشان پێی ووتم: کوڕم ئەوەی تۆ پرسیاری لێ دەکەیت مرد .. ئەمەش خۆڵی قەبرەکەیەتی بەر لە تۆزێك ناشتومانە .

وتم: مامە ئەم بەیانی یە قسەی لەگەڵ کردم ..

باوکی ووتی: دوای ئەوەی نوێژی نیوەڕۆی کرد، لە مزگەوت مایەوە بۆ خوێندنی قورئان، پاشان هاتەوە ماڵ بۆ قەیلولە کردن، کە ویستمان بۆ نان خواردن خەبەری بکەینەوە ڕۆحی بەرەو لای خوا ڕۆیشتبوو.

باوکی بەردەوام بوو لەسەر قسەکانی: کوڕەکەی من لەو جۆرە کەسانە بوو کە بە ئاشکرا گوناهی دەکرد، بەڵام بەر لە دوو هەفتە گۆڕا و ئیتر ئەو خەبەری دەکردینەوە بۆ نوێژی بەیانی کە بەر لەوە بۆ نوێژ هەڵنەدەستا.

ئەو لەناو ماڵەکەی خۆماندا و بەئاشکرا و بەبەرچاومانەوە بێ فەرمانی

دەکرد، پاشان خوای گەورە بەر لە ماوەیەکی کەم منـەتی هیدایـەتی بەسـەردا ڕشت و گۆڕا.

پرسیاری لێکردم: کەی کوڕەکەی منت ناسی؟

ووتم: بەر لە دوو هەفتە.

– کەواتە ئەو کەسەی کە ئامۆژگاری کردووە تۆ بویت؟

– بەڵێ

وتی: ڕێم بدە سەری ئەو کەسە ماچ بکەم کە کوڕەکەمی لە ئـاگر ڕزگـار کرد.

سەرچاوە : کاسێتی "نهاية الشباب"

پێغەمبەری خـوا (صـلی الله علیـه وسـلم) ڕاسـتی فـەرمووە: "اذا اراد الله عزوجل بعبد خيرا، عسله، قيل : وما عسله؟ قال "يفـتح الله عزوجـل لـه عمـلا صالحا قبل موته ، ثم يقبضه عليه" صحيح رواه احمد.

## كۆتایی هاوڕێكەم

گەنجێك گێڕایەوە ووتی:

ئێمە كۆمەڵێك لاو بووین، لە زانكۆیەك دەمانخوێند، هاوڕێیەكی خۆشەویستمان هەبوو ناوی موحەمەد بوو.

محمد ئەو لاوە بوو كە شەوەكانی بۆ زیندوو دەكردینەوە، توانایەكی باشی شمشاڵ لێدانی هەبوو بە جۆرێك ئێسقانی لەشمانی دەخستە سەما.

هەموو ئەو بۆچونەمان هەبوو كە بەسەربردنی شەو بەبێ محمد هیچ خۆشی تیدا نی یە و ئەو شەوە وەك مردوو وەهایە.

ڕۆژگار بەم جۆرە تێپەڕ بوو، هەتا ڕۆژێك محمد هات بۆ زانكۆ، بەلاّم ئەو موحەمەدەی جاران نەبوو، ڕەنگ و ڕوخساری تەواو گۆڕابوو، نیشانەی ئارامی و ترسان لە خوای پێوە دیار بوو، چووم بۆ لای و قسەم لەگەڵ كرد و پێم ووت:

محمد ئەوە چیتە؟ ئەوە ئەو دەموچاوە نىیە كە من و هاورێكانم ئەیناسین.

محمد بە زمانێكی شیرین وەلاّمی دامەوە:

هاوڕێی ئازیزم وازم لە بێهودەیی و تیاچوون هێناوە، ئێستا بەرەو لای خوا گەڕاومەتەوە و تەوبەم كردوە .

پێم ووت: هەرچۆنت كردووە ئاهەنگی ئەمشەو لە كیس مەدە، میوانێكمان هەیە خۆشت ئەوێت ئەویش فلاّن كەسی گۆرانی بێژە.

–تكایە بمبورە هاوڕێكەم من ئیتر بڕیارم داوە چیتر نەچمە ئەم كۆڕە بی كەڵكانەوە،لێم تێگەیشتی .

هاوڕێ لاوەكەی بەم وەلاّمە شێت و تورە بوو ..

**محمد** پیٚی ووت:

گویٚم لیٚبگرە، دەزانی تەمەنت چەندی ماوە؟ ئیٚستا تۆ ئەوپەڕی هیٚز و توانای لاشەیی و میٚشکت هەیە، ئەم توانایە بەردەوام نابیٚت،ئیٚستا تۆ لەناو توانستیٚکی گەنجانەدا دەژیت هەتا کەی لەناو تاواندا دەمیٚنیتەوە و خۆت لە گوناهدا نوقم دەکەیت؟

بۆ ئەم تەمەنە کە گەورەترین سەرمایەتە بەکارناهیٚنی لەکاری خیٚر وچاکە و بەندایەتی کردندا؟

**محمد** بەردەوام بوو لە ئامۆژگاری کردن و کۆمەڵیٚك ئامۆژگاری و پەند و ووتەی جوان لە دڵە پاك و ڕاستەکەیەوە هاتە دەر، داوای لیٚ کردم تەوبەیەکی ڕاست بکەم.

پیٚی ووتم: ئەی فلاٚن هەتا کەی بیٚ ئاگایت؟ نەنویٚژ بۆ خوا دەکەیت و نە بەندایەتی؟ ئەی نازانی ئەمڕۆ بیٚت یان سبەی دەمریت، چەند گەنجی لەخۆبایی هەبوون کە فریشتەی گیانکیٚش بەردەرگای پیٚ گرتن، چەند کەس هەیە بەبیٚ ئاگایی چاوەڕوانی تەواو بونی مانگە بەلاٚم نازانیٚ کە کاتی تەمەنی لە تەواو بوون نزیکە، چەند هەیە کە نوقمی خۆشی و ڕابواردنە بەلاٚم دەرك بەوە ناکات و هەست ناکات کە ئاوا بونی تەمەنی نزیك بۆتەوە ..

ئەم لاوە دەڵیٚت:

بەو جۆرە لەیەکتر جیابوینەوە، ڕۆژی دوایی هەینی بوو نەچوینەوە بۆ زانکۆ، بەلاٚم بۆ شەممە کە دەبووە دووەم ڕۆژی مانگی ڕەمەزان چووم بۆ کۆلیج ، بەڕاستی دیمەنەکە زۆر سەیر بوو هەموو ئەو لاوانەی کە بەرچاوم دەکەوتن خەمبار دیار بوون هەموو دەموچاویان گۆڕا بوو.

پێم ووتن: ئەوە چیتانە؟

یەکێکیان ووتی: دوێنێ محمد لە نوێژی هەینی هاتۆتە دەر ئوتومبێلێك بە خێرایی لێیداوە، ئەو بە زمانی ڕۆژوەوە گیانی گەیاندەوە خوای پەروەردگار .. لا الـه الا الله ...

چەندە کۆتاییەکی جوانی دەست کەوت، عەسری ئەو ڕۆژە نوێژمان لەسەری کرد و بە گڵ دامان پۆشی، بەڕاستی دیمەنێکی کاریگەر بوو.

(لەکاسێتی: کل من علیها فان).

# كۆچی نورا

جەستەی بەردەوام بەرەو لاوازی دەچوو، دەموچاوی ڕەش دادەگەڕا ، وەك هەمیشە بەردەوام قورئانی دەخوێند، كاتێـك بـە دواییـدا بگەڕایتایـە لەشـوێنی نوێژەكەی دەتبینی لـە كڕنۆش یان سوجدەدا بوو یان دەسـتی بڵنـد كردبـوو و خەریكی نزا و پاڕانەوە بوو، بەم جۆرە كاتەكانی دەگوزەراند لـە بەیانیاندا و لـە ئێوارانـدا و لـە ناو تاریكایی شەودا، ئەو هەرگیز لـە بەندایەتی بێتاقەت و ماندوو نەدەبوو .

منیش بەردەوام خەمم لـە گۆڤارە هونەریەكان و ئەو كتێبانـە دەخـوارد كـە تایبەت بوون بە چیرۆك، كاتێكی زۆرم بە سەیر كردنی ڤیدیۆوە بەسەر دەبرد بە شێوەیەك كە پێی ناسرا بووم، لەپاڵ ئەمانەدا ئەوەی كە زۆر پێ‌ی ناسـرا بـووم بەجێ نەهێنانی ئەركەكانم بوو كە لـەناویاندا ئەوە بوو نوێژەكانم بە تەواوی جێ بەجێ نەدەكرد ..

شەوێك بۆ ماوەی سێ كاتژمێر سەیری فلیمی جۆراو جۆرم كرد ، كاتێـك ڤیدیۆكەم كوژاندەوە و ویستم بچمە جێگاكەمەوە گوێم لـە دەنگی بانگی بەیانی بوو ، لـەو كاتەدا نورای خوشكم بانگی كردم ، كە چووم لـەشوێنی نوێژەكەی بوو

–بەڵێ، نورا چیت ئەوێ؟

بەدەنگێكی تیژ پێ‌ی ووتم: هەتا نوێژی بەیانی نەكەیت نەخەویت ..

ووتم: ئۆی، هێشتا كاتژێرێكی ماوە بۆ بانگی بەیانی، ئەوەی گوێـت لێبـوو بانگی یەكەم بوو ..

بە دەنگێكی پڕ لـە خۆشەویستی وەڵامی دامەوە (ئەو هەروا بـوو هـەتا بـەر

لەوەی توشی ئەو نەخۆشیە پیسە بێت و لەسەر جێگا بکەوێت):

–هەنا وەرە بۆ لام ..

هەرگیز نەمدەتوانی وەڵامی داوای نەدەمەوە .. چونکە هەستم بە پاکی و ڕاستگۆیی دەکرد تیایدا .. پێم ووت:

–بەڵێ چیت ئەوێت؟

–دانیشە ..

–ئەوە دانیشتم چیت ئەوێت ؟

بەدەنگێکی خۆشەوە ئەم ئایەتەی بۆ خوێندم:

{كُلُّ نَفْسٍ ذَآئِقَةُ الْمَوْتِ وَإِنَّمَا تُوَفَّوْنَ أُجُورَكُمْ يَوْمَ الْقِيَامَةِ فَمَن زُحْزِحَ عَنِ النَّارِ وَأُدْخِلَ الْجَنَّةَ فَقَدْ فَازَ وَما الْحَيَاةُ الدُّنْيَا إِلاَّ مَتَاعُ الْغُرُورِ }آل عمران١٨٥

پاشان تۆزێك بێدەنگ بوو .. لێ ی پرسیم : ئایا باوەڕت بە مردن هەیە؟

پێم ووت: بەڵێ باوەڕم پیێ هەیە ..

ووتی: ئەی باوەڕت نی یە کە لێپرسینەوەت لەگەڵ دەکرێت لەسەر هەموو گەورە و بچوکێك؟

–با، بەڵام خوا لێبوردە و بە بەزەیی یە، تەمەنیش بە بەریەوە ماوە.

–ئەی لە مردنی کوتوپڕ ناترسیت؟ سەیری هند لە تۆ بچوکتر بوو لە ڕوداوێکی ئوتومبێلدا گیانی سپارد، .. فلان .. فلان .. فلانی تر .. خوشکەکەم مردن تەمەن ناناسێت و تەمەنیش نابێە پێوەر.

بە دەنگێکی ترساو وەڵامم دایەوە لە کاتێکدا شوێنی نوێژەکەی تاریك بوو: من لە تاریکی دەترسم و تۆش بە مردن منت ترسان، ئێستا چۆن بخەوم؟ من وامدەزانی کە تۆ ڕازی دەبیت ئەم پشووە گەشتمان لەگەڵ بکەیت.

لە پڕ دەنگی گۆڕا و منیش دڵم بۆی داخورپا ..

ووتی: لەوانەیە ئەمساڵ گەشتێکی دوور بکەم .. بۆ شوێنێکی تر .. هەنا لەوانەیە وابێت، تەمەن بە دەست خوایە ... دەستی بە گریان کرد ..

بیرم لە نەخۆشیەکەی کردەوە، پزیشکەکان بە نهێنی بە باوکمیان وتبوو ئەم نەخۆشیە لەوانەیە زۆر بواری نەدات .. بەڵام کێ ئەم هەواڵەی پێداوە .. لەوانەیە خۆی پێشبینی ئەوە بکات؟

پێم ووت: نورا چیتە بیر لە چی دەکەیتەوە؟

بەدەنگێکی بەهێزەوە پێی ووتم:

وادەزانی بۆیە ئەم قسانە دەکەم چونکە نەخۆشم؟ نەخێر .. لەوانەیە تەمەنم لەو کەسانەی لەشیان ساغە زۆرتربێت.. ئەی تۆ هەتا کەی دەژیت؟ لەوانەیە بیست ساڵ .. چل ساڵ .. پاشان چی؟

دەستی لەناو تاریکاییدا دەبریسکایەوە کە بە توندی ڕایدەوەشاند .. ووتی: جیاوازی چیەیە لە نێوانمان، هەمومان لەم دونیایە کۆچ دەکەین و دەڕۆین بۆ بەهەشت یان بۆ دۆزەخ .. بەخێر خەبەرت بێتەوە هەنا ..

بەخێرایی دەڕۆیشتم بۆ ناو جێگاکەم لەکاتێکدا گوێم لە دەنگی بوو، خوا هیدایەتت بدات .. نوێژەکەت لە بیر نەچێت ..

گوێم لە لێدانی دەرگا بوو ، سەیری کاتژێرەکە کرد هەشتی بەیانی بوو، ئەمە کاتی هەستانم نەبوو بەڵام گوێم لە دەنگە دەنگ و گریان بوو دەبێت چی ڕوویدابێت؟

تەندروستی نورای خوشکم تێکچوو بوو .. باوکم برد بوی بۆ نەخۆشخانە .. إِنَّا لِلّهِ وَإِنَّـا إِلَيْهِ رَاجِعونَ .. ئەمساڵ گەشت ناکەین .. لەسەرم نوسراوە ئەمساڵ لەماڵی خۆمان بمێنمەوە ..

دوای چـاوەڕوانیەکی زۆر، کاتـژێر بـوو بـە یـەکی نیـوەڕۆ بـاوکم لـە نەخۆشخانەوە تەلەفونی بۆ کردین ووتی:

دەتوانن ئێستا بێن بۆ سەردانی، خێرا وەرن ..

دایکم ووتی: قسەی باوکت ئاشکرا نەبوو و دەنگی گۆڕابوو .

سوار ئوتومبێل بوین، دایکم لە تەنیشتمەوە نزای بۆ دەکرد .. بە ڕاستی ئەو کچێکی صوڵحاو و گوێڕایەڵ بوو .. هەرگیز نەمدی بوو کات بە فیڕۆ بدات .. لـە دەرگـای دەرەوەی نەخۆشـخانە چـوینە ژوورەوە و بـەخێرایی بەسـەر قادرمەکاندا سەرکەوتین ...

پەرستارەکە پێ‌ی ووتین: لە ژووری چاودێری ووردە دەتانبەم بۆ لای، نورا کچێکی باشە.

دایکمی دڵنیا کردەوە کە بەرەو باش بون دەچێت لە دوای ئەو بێهۆشـیەی کە بەسەریدا هاتووە .. پاشان پێ‌ی ووتین: ڕێگا نادرێت لە کەسێك زیاتر بچێتە ژوورەوە چونکە ئەمە ژووری چاودێری کردنی ووردە ..

لە پەنجەرەیەکی بچووکی دەرگای ژوورەکەوە سەرنجی نـاوەوەم دەدا ، لـە نێو قەرەباڵغی پزیشکەکاندا چـاوەکانی نـورام بینـی ئـەویش سـەرنجی دەدامـێ ،دایکیشم لە پەنایەوە وەستا بوو ، دوای دوو خولەك دایکم هاتە دەر چـونکە توانای شاردنەوەی فرمێسکەکانی نەبوو.

بواریاندا بچمە ژوور بـەڵام بـەو مەرجـەی زۆر قـسەی لەگـەڵ نەکـەم .. سەلامم لێکرد .. پێم ووت : نورا چۆنی؟ دوێنی باش بویت .. چی ڕویدا؟

دوای ئەوەی دەستی گوشیم وەڵامی دامەوە: سوپاس بـۆ خـوا باشـم ئێـستا باشم، لە قەراغی جێگاکەیەوە و لە تەنیشتیەوە دانیشتم دەستم بـەر قاچـەکانی کەوت، بەڵام ئەو دووری خستەوە، پێم ووت: داوای لێبوردن دەکەم ئەگـەر

تەنگاوم كردبیت .. ووتی: نەخێر .. بەڵام فەرمودەیەكی خـوای گـەورەم بـیر كەوتەوە كە دەفەرموێت:

{وَالْتَفَّتِ السَّاقُ بِالسَّاقِ }{إِلَى رَبِّكَ يَوْمَئِذٍ الْمَسَاقُ }القيامة ٢٩ ، ٣٠

هەنا داوات لێدەكەم نزام بۆ بكەیت لەوانەیە بـەم نزیكانـە پێـشوازی لــە یەكەم رۆژی دوایی بكەم، گەشتەكەم دوورە و توێشوم كەمە ..

كە ئەوەم بیست فرمێسك لە چاوم هاتە خوار و دەسـتم بـە گریـان كـرد، تێبینی ئەوەم نەكرد كە من لـە كوێم، لـەسەر گریان بەردەوام بووم، بـەجۆرێك باوكم لـەتاو من نورای بیرچۆوە .. پێشتر بە گریانی لـەم جۆرە ڕانەهاتبوین ..

لـەگەڵ ئاوابونی ئەو ڕۆژە خەمناكە، بێدەنگیەكی درێـژ خایـەن بـاڵی كێـشا بەسەر ماڵـەكەماندا، كچەكانی پورم و خاڵـم هاتنە لامان .. ڕوداوی خێرا هاتـە بەرەوە .. میوانمان زۆر بوون .. دەنگەكان تێكەڵ بەیەك دەبـوون.. یـەك شـتم زانی .. نورا مرد.

ئەوانەم جیا نەدەكردنەوە كە دەهاتن .. نازانم چییان ووت .. خوایە من لــە كوێم؟ چی ڕودەدات؟ تەنانەت توانای گریانم نەمابوو .. ئەوەم بیركەوتەوە كە نورا هاوەڵ و شەریكم لـەناو مناڵانی دایكمدا، چونكە ئێمـە دووانـە بـووین .. ئەوەم بیرە كە نورا هاوبەشی خەمەكانم بوو و لـەگەڵی بەش دەكردم .. ئەو بوو بەردەوام نزای هیدایەتی بۆ دەكردم .. ئەو كەسەی شەوانێكی درێژ فرمێـسكی دەڕشت و باسی مردن و لێپرسینەوەی بۆ دەكردم.

خوا یارمەتیمان بدات .. ئەمشەو یەكەم شەوە و ئەو بۆتە میوانی گۆڕەكەی .. خوایە ڕەحمی پی بكە و گۆڕەكەی بۆ ڕۆشن بكە .. ئەوە شوێنی نوێژەكەیەتی .. ئەوە قورئانەكەیەتی .. ئەوە بەرماڵـەكەیەتی .. ئەوە .. ئەوە .. بەڵكو ئـەوە

پۆشاکە گوڵیە جوانەکەیەتی کە پیٚی وتم ئەیشارمەوە بۆ کـاتی شـووکردنم .. بیرم کەوتەوە و گریام بۆ ڕۆژە فەتاوەکانم .. گریام بە بەردەوامی گریام ، لـە خوا پاڕامەوە کە لیٚم خۆش بیٚت و بمبەخشیٚت .. نزام لای خـوا کـرد کـە لـە گۆڕەکەیدا دامەزراوی بکات وەك چۆن بەردەوام حەزی دەکرد نزا بکات .

خوا ڕەحمەت پیٚ بکات.

الزمن القادم عبدالملك القاسم

# بڵاوکراوەکانی پرۆژەی (تیشك)

| ژ | ناوی کتێب | نووسەر |
|---|---|---|
| ١ | بەئیسلامکردنی کورد، ماستەرنامە یان هەڵەنامە؟ | ن: فازل قەرەداغی |
| ٢ | نەزانیی و بێشەرمیی، بەشێك لە چەواشەکارییەکانی مەریوان هەڵەبجەیی لە کتێبی (سێکس و شەرع و ژن)دا | ن: عومەر کەمال دەروێش |
| ٣ | ئاشتینامە، وەڵامێك بۆ (خوێننامە)ی زەردەشتی | ن: ئامینە صدیق |
| ٤ | فەتواکەی مەلای خەتێ، ئەفسانەی مێژوونووسێك | ن: حەسەن مەحمود حەمەکەریم |
| ٥ | صەلاحەددینی ئەییوبی، گەورەتر لە رەخنەگرانی، گفتوگۆ لەگەڵ پرۆفیسۆر دکتۆر موحسین موحەممەد حسێن | ئا: ئارام عەلی سەعید |
| ٦ | بەرەو بەختیاری ئافرەت (بەرگی یەکەم) | جەمال حەبیبوڵڵا (بێدار) |
| ٧ | ئازادیی رادەربڕین لە رۆژئاوا، لە سەلمان روشدییەوە بۆ رۆجیە گارودی | ن: د. شەریف عەبدولعەزیم<br>و: وەرزێر حەمەسەلیم |
| ٨ | بەجیهانیکردن، دیدێکی ئیسلامیی | ن: د. موحسین عەبدولحەمید<br>و: حەمەکەریم عەبدوڵڵا |
| ٩ | کوردستان لەبەردەم فتوحاتی ئیسلامیدا | ن: حەسەن مەحمود حەمەکەریم |
| ١٠ | بەرەو بەختیاریی ئافرەت (بەرگی دووەم) | ن: جەمال حەبیبوڵڵا (بێدار) |

| | | |
|---|---|---|
| ١١ | مێژووی دێرینی کوردستان (کتێبی سێیەم) | ن: فازل قەرەداغی |
| ١٢ | سەدەیەك تەمەنی نوورین، مامۆستا عەبدولکەریمی مودەڕیس بە پێنووسی خۆی بناسە | ئا: عەبدولدائیم مەعروف هەورامانی |
| ١٣ | دەوڵەتی خیلافەت، بوژاندنەوەی کۆمەڵگەو گەشەسەندنی شارستانییەت | ن: ئیکرام کەریم |
| ١٤ | لە سەرگوزشتەکانی ژیان، ئەدەبی گاڵتەوگەپ، روداوی مێژوویی، بیرەوەریی | ن: شێخ موحەممەد خاڵ |
| ١٥ | پرۆژەی دەستووری هەرێمی کوردستان رامان‌و سەرنج‌و پێشنیار | ئا: پرۆژەی تیشك |
| ١٦ | بیست‌و سێ ساڵ سەروەریی | ن: ئەحمەد حاجی ڕەشید<br>دکتۆر صەباح بەرزنجی پێشەکی بۆ نووسیوە |
| ١٧ | قورئان وەحی ئاسمانە، نەك ڕەنگدانەوەی سەردەمی خۆی | ن: بەکر حەمەصدیق |
| ١٨ | ئیسلام‌و سیاسەت، لێکۆڵینەوەیەك لەمەڕ پەیوەندی نێوان ئیسلام‌و سیاسەت | ن: ئارام قادر |
| ١٩ | سوپای ئەیوبیان لە سەرودەمی سەلاحەددیندا پێکهاتنی، ڕێکخستنی، چەکەکانی، هێزی دەریایی‌و شەڕو جەنگە گرنگەکانی | ن: پرۆفیسۆر دکتۆر موحسین موحەممەد حسێن<br>و: عوسمان عەلی قادر |
| ٢٠ | پوختەیەك دەربارەی ڕۆژوو | ن: عەبدوڕڕەحمان نەجمەدین |
| ٢١ | ڕۆڵی پرشنگداری زانا موسوڵمانەکان لە پێشکەوتنە زانستییەکاندا | ن: د. کاوە فەرەج سەعدون |

| | | |
|---|---|---|
| ٢٢ | یەکەمین دەستووری نووسراو لە جیهاندا، بەڵگەنامەیەکی گرنگی سەردەمی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) | ن: موحەممەد حەمیدوڵڵا<br>و: شوان هەورامی |
| ٢٣ | ئیسلامناسیی یان ئیسلامنەناسیی، وەڵامێك بۆ کتێبی (ئیسلامناسی) عەلی میرفطروس | ن: ئیکرام کەریم |
| ٢٤ | بەرەو بەختیاریی ئافرەت (بەرگی سێیەم) | ن: جەمال حەبیبوڵڵا (بێدار) |
| ٢٥ | ئیشکردن نەك تەمەڵی | عەبدولعەزیز پاڕەزانی |
| ٢٦ | دوورگەی بیناسازان، چیرۆکێکی پەروەردەییە بۆ گەورەو بچووکی ئەم نەوە نوێیە | نووسینی: د. عەبدولحەمید ئەحمەد ئەبو سلێمان<br>وەرگێڕانی: ئامینە صدیق عەبدولعەزیز |
| ٢٧ | زمانی گەردەلوول، خەونی شنەبا<br>کۆمەڵە دیدارێکە لەسەر شیعر، فەرهەنگ، زمان، تەسەووف، ڕۆژهەڵاتناسی، ژن، ڕەخنەی ئەدەبی، ڕووناکبیر و دەسەڵات | فەرهاد شاکەلی |
| ٢٨ | هەڵەبجە ١٨٨٩ ـ ١٩٣٠، لێکۆڵینەوەیەکی مێژوویی سیاسییە | ن: عادل صدیق |
| ٢٩ | بەرگری لە قورئان دژی ڕەخنەگرانی | ن: عەبدوڕڕەحمان بەدەوی<br>و: وەرزێر حەمەسەلیم |
| ٣٠ | فەرموودە هاوبەشەکانی بوخاری و موسلیم | ئامادەکردن و وەرگێڕانی: حەمەکەریم عەبدوڵڵا |
| ٣١ | مەلا ئیدریسی بەدلیسی، ڕۆڵی لە یەکخستنی میرنشینە کوردییەکاندا | ن: حەسەن مەحمود حەمەکەریم |

| | | |
|---|---|---|
| ٣٢ | شێخ مەحمودی حەفید (١٩٢٢ – ١٩٢٥) | ن: ئومێد حەمەئەمین |
| ٣٣ | ئیسلام لەبەردەم دوڕیاندا | ن: لیوبو لدڤایس<br>و: عەبدول حسێن |
| ٣٤ | ڕامیاری لە ئیسلامدا | ن: ئەحمەد کاکە مەحمود |
| ٣٥ | وەڵامی پرسیارەکان، ڕەواندنەوەی کۆمەڵێك گومان سەبارەت بە ڕاستییەکانی ئیسلام | ن: دکتۆر کەریم ئەحمەد |
| ٣٦ | مرۆڤ و پەیامداری | ن: قانع خورشید |
| ٣٧ | سەید قوتب، لە هاتنەدنیاوە تا شەهیدبوون | ن: د. سەلاح عەبدولفەتاح ئەلخالیدی<br>و: تارق نەجیب ڕەشید |
| ٣٨ | عوسمانی کوڕی عەففان، کەسایەتی و سەردەمەکەی | ن عەلی موحەممەد سەللابی<br>و: حەمید موحەممەد عەبدوڵڵا |
| ٣٩ | خوانی ڕووح، توێژینەوەیەکە دەربارەی گەورەیی و پیرۆزیی نوێژ | ن: مەلا ئەحمەدی شەریعە |
| ٤٠ | ئەلفبێی لاتینی.. زمانی ستاندارد | ئامادەکردنی: ڕەوشت محەمەد |
| ٤١ | بنەماکانی فیقهی ئیسلامیی(بەرگی یەکەم) | نووسینی: د. صباح بەرزنجی |
| ٤٢ | پوختەیەك دەربارەی ڕاگەیاندن و ڕاگەیاندنی ئیسلامیی | ن: ئەحمەد ئیبراهیم وەرتی |
| ٤٣ | دەروازەیەك بۆ زانستەکانی قورئان | ن: ئیکرام کەریم |
| ٤٤ | بیرەوەرییەکان دەبنە گرنگ، دیمانەی مامۆستای دێرین ئەحمەد سەعید | ئا: ئەحمەد حسین ئەحمەد |
| ٤٥ | گەنجینەکانی دوورگەی بیناسازان | ن: د. عەبدولحەمید ئەحمەد ئەبوسلێمان |

| | | و: بوشرا صدیق عەبدولعەزیز |
|---|---|---|
| ٤٦ | پەروەردەی منداڵان لە ئیسلام دا | نووسینی:<br>د. عەبدوڵڵا ناصح عەلوان<br>وەرگێڕانی:<br>ناصح ئیبراهیم سازانی |
| ٤٧ | فڕی فڕی قەل فڕی | نووسینی: مەلا موحەممەدی جەلی کۆیی (مەلای گەورە)<br>قانع خورشید پێشەکی بۆ نووسیوەو ڕێکیخستووەتەوەو پەراوێزی بۆ داناوە |
| ٤٨ | کۆچ<br>کۆمەڵە چیرۆکێکی واقیعیی کۆمەڵایەتییە | نووسینی:یوسف حاج ئەحمەد<br>وەرگێڕانی: کاوە محەمەد شارباژێڕی |